**ناوی کتێب:** ئیسلامو سیاسەت، لێکۆڵینەوەیەك لەمەڕ پەیوەندی نێوان ئیسلامو سیاسەت
**نووسینی:** ئارام قادر
**ژمارەی سپاردن:** (467) ساڵی (2007)
**شوێنی چاپ:** کۆمپانیای چاپو پەخشی نووسەر
**نۆرەی چاپ:** یەکەم
**ساڵی چاپ:** 2007
**تیراژ:** 1500
**لە بڵاوکراوەکانی:** پرۆژەی (تیشك)، زنجیرە ( 18)

**ناونیشانی پرۆژە لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت :** www.tishkbooks.com
**ئیمەیلی پرۆژە:** info@tishkbooks.com
tishkbooks@yahoo.com



## سوپاسو پێزانین

**سوپاسو پێزانینی خۆم ئاراستەی هەردوو بەڕێز کاك تۆفیق کەریمو کاك ئارام عەلی سەعید دەکەم، کە ئەرکی پێداچونەوەو وردبینی نووسینەکەیان گرتە ئەستۆ، خوای گەورە نموونەیان زیاد بکات.**

## بسم الله الرحمن الرحيم

وَأَنزَلْنَا إِلَيكَ الْكِتَابَ بِالْحَقِّ مُصَدِّقاً لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ الْكِتَابِ وَمُهَيْمِناً عَلَيْهِ فَاحْكُم بَيْنَهُم بِمَا أَنزَلَ اللّهُ وَلاَ تَتَّبِعْ أَهْوَاءهُمْ عَمَّا جَاءكَ مِنَ الْحَقِّ لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجاً وَلَوْ شَاء اللّهُ لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً وَلَكِن لِّيَبْلُوَكُمْ فِي مَا آتَاكُم فَاسْتَبِقُوا الخَيْرَاتِ إِلَى الله مَرْجِعُكُمْ جَمِيعاً فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ* وَأَنِ احْكُم بَيْنَهُم بِمَا أَنزَلَ اللّهُ وَلاَ تَتَّبِعْ أَهْوَاءهُمْ وَاحْذَرْهُمْ أَن يَفْتِنُوكَ عَن بَعْضِ مَا أَنزَلَ اللّهُ إِلَيْكَ فَإِن تَوَلَّوْاْ فَاعْلَمْ أَنَّمَا يُرِيدُ اللّهُ أَن يُصِيبَهُم بِبَعْضِ ذُنُوبِهِمْ وَإِنَّ كَثِيراً مِّنَ النَّاسِ لَفَاسِقُونَ) (المائدة: 48 ـ 49).

واته: (ئەم قورئانەمان ناردە خوارەوە بۆ تۆ ئەی محمد بەحەق‌و ڕاستی کە کتێبەکانی پێش خۆی بە ڕاستدەزانی و پشتیوانیان لێدەکات، شاهیدو حاکمە بەسەر کتێبەکانی پێش خۆی، کەواتە: حوکم بکەو بڕیار بدە بەوەی کە خوا ناردوویەتیە خوارەوە، وە شوێن ئارەزوو ویستی ئەوان نەکەویت، لانەدەی لەو حوکم‌و بڕیارە هەق‌و ڕاستەی کە بۆت نێردراوە، بۆ هەر نەتەوەیەك لە ئێوە شەریعەت‌و بەرنامەیەکمان بۆ دەستنیشان کردووە، گەر خوا ویستی لەسەر بوایە ئێوەی دەکرد بە یەك نەتەوەو کۆمەڵ، بەڵام نەیکردوون بەیەك نەتەوە بۆ ئەوەی تاقیتان بکاتەوە لەسەر ئەو شەریعەت‌و یاسایەی بۆی ناردوون، کەواتە پێشبڕکێ بکەن لە چاکەکردن‌و کاری خێردا، لە ڕۆژی دواییدا هەمووتان دەگەڕێنەوە لای خوا، لەرۆژی دواییدا ئاگادارتان دەکاتەوە لەوکاتەدا کە لە دونیادا بوون لەسەرچی لەنێو خۆتاندا ناکۆك‌و جیاوازبوون، فەرمانت پێدەکەین کە حوکم بکە لە نێوانیاندا بەوەی کە خوا ناردوویەتیە خوارەوە، شوێن حەزو ئارەزویان نەکەوویت، لێیان وریابە سنورت پێ نەبەزێنن لە هەندێك لەو بڕیارو حوکمانەی کە خوا ناردوویەتیە خوارەوە بۆت، گەر لە حاڵەتێکدا ئەوان سەرپێچییان کرد ئەوە بزانەو دڵنیابە کە خوا دەیەوێ بەهۆی هێندێ لە تاوانەکانیان سزایان بدات، بێگومان زۆرێك لەمرۆڤەکان سەرکەشن‌و سنورەکانی خوا دەبەزێنن).

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

### پێشەکی

دەستپێکی ئەم بابەتە بەوە والآ دەکەمەوە کەلە مێژووی ئیسلامیداو لە کاتی ممارەسەی کاری سیاسیو دەسەلآتدا لەلایەن دەسەلآتدارانەوە، چ وەك خودی خەلیفەو والییەکان، یان کاربەدەستانی دامودەزگا جیاجیاکان، چەندین هەڵەی زەقو ستەمو نارێکی ڕوویداوە، هەروەها لە ڕووی تیۆریش لەلایەن هەندێك زاناو بیریارانی ئیسلامی هەڵەی زەقو فەتوای نادروست هەبووە، مێژوویەك نزیکەی سیانزە سەدەو نیوی خایاند بێت بێ سلبیاتو کەموکورتی نییە، موسڵمانانی ئەمڕۆ نابێت بەڕەهایی پاکانە بۆ ئەو مێژووە بکەنو ئەو کەسانە تەزکیە بکەن کە هەستاون بە فەتوادانو ڕاڤەکردنی ئیسلامو تەرجەمەکردنی بۆ واقع، مێژووی ئیسلامیش دەبێت هەڵسەنگاندنی نوێو سەرلەنوێی بۆ بکەین، ناکرێت هەڵسەنگاندنمان بە چاوی تەقدیسەوە بێت بۆ هەموو مێژوو ئەوانەی لە مێژوودا ڕۆڵیان بینیوە، ئەوەی لە مێژوودا ڕوویداوە خودی ئیسلام نییە، بەڵکو ڕاڤەی ئیسلامەو هەوڵی چەساپاندیەتی لەجیهانی واقعدا، نابێت بواردن بکەین لە نێوان ئەوەی کە چاكو نابابەو ئەوەی سلبیو نارێکە، بەڵکو با ئەوەی لە مێژوودا ڕوویداوە بە چاكو خراپەوە ئەوە بخەینە ڕوو، ئەوەش واقعیی مێژووی ئیسلامە، نابێت ئینتقائی بینو ئەوەی ڕاستو دروستە بۆ نەوەکانی ئێستاو داهاتووی ڕوون بکەینەوەو ئەوەی هەڵەو کەموکورتیشە پینەو پەردەپۆشی بکەین، بەڵکو دەبێت بەگشتگیری مێژوو وەربگرێنو دەبێت خوێندنەوەمان بۆ مێژوو گشتگیرانە بێتو بەلاشمانەوە ئاسایی بێت کە هەڵەو کەموکورتیو سلبیات هەبوو بێت لە کارو کاروانی ئیسلامیدا، یەکەم بۆ ئەوەی خەڵك وا تێنەگات گەر ئیسلام هاتەمەیدانی جێبەجێکردن هەڵەو کەموکورتی نابێتو تاوان نامێنێت، لە لایەکی تر با بەهەڵەو ناتەواوی لەمێژوو نەگەین، هەڵسەنگاندنو خوێندنەوەیەکی نوێ بۆ کاروبارەکانی مێژووی ئیسلامیی زەرووڕەتێکی سەردەمەو دەبێت پشتگوێ نەخرێت بە تایبەت بۆ حاڵەتی ئیسلامیی ئەمڕۆ، ئیسلامییەکان نابێت لە ڕەخنە بترسن بەرانبەر بە مێژووی ئیسلامیی، بە تایبەت لە بارەی هەڵسوکەوتی دەسەلآتداران، فیکرو تێڕاوانینی زانایان، هەڵسووکەوتی کاربەدەستان بەرانبەر بە گەلەکانیان، یان هەڵوێستی فەرمانڕەواییان بەرانبەر سامانی گشتی، یان چۆنییەتی بەڕێوەبردنو ممارەسەی ئیسلام لە دەسەلآتدا، یان ڕای زانایان سەبارەت بە هەندێك بابەتی بایەخدارو پەیوەست بە مرۆڤو کۆمەڵگاو دەسەلآتەوە، ئەمە بابەتێکی هەستیارو گرنگەو دەبێت ئیسلامییەکان بە عەقڵیەتێکی فراوانو تێگەشتنێکی نوێ لە ڕەخنەگرتن لە مێژوو بگەن، بەلآم ئەوەی جێگەی تێبینیو سەرسوڕمانە ماوەیەکە لە کوردستان لە ڕێگەی نامیلکەو بڵاوکراوەو گۆڤارو سیمینارو کۆڕە گشتییەکانەوە مەسەلەیەك خراوەتە ژێر پرسیارەوەو گفتوگۆی لەسەر دەکرێت ئەویش ئەوەیە (گوایە ئیسلام بە سیاسی کراوە! ئیسلام بەرنامەی سیاسیی نییە، ئیسلام پرۆژەیەکی بۆ دەسەلآت پێ نییە! یان گەر بەرنامەشی هەبێت بۆ دەسەلآت بۆ ئەم سەردەمو دۆخەی ئێستا ناگونجێت کە سەردەمی پێشکەوتن زانستو تەکنەلۆژیایە! تێکەڵکردنی سیاسەتو ئیسلام دەبێتە هۆی دابەشکردنی گەل لەسەر بنەمای مەزهەبیو تایفی! یان پێویستە ئیسلامو سیاسەت لێك جودا بکرێتەوەو هەریەکەیان ڕۆڵی خۆی ببینێت لە ژیاندا، تێکەڵکردنی دەسەلآتو دین سەرئەنجامەکەی تاکڕەویو ستەمو چەوسانەوەی دینی دەبێت!!).

پێویستە ئاماژە بەوە بکرێت کە سەرچاوەی ئەم جۆرە بیرکردنەوەو هەڵسەنگاندنانە دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای لێکترازاندنی کەنیسەو دەسەلآت لە ئەوروپا لە پاش سەرکەوتنی شۆڕشی فەرەنسی لە ساڵی 1789ز، سەرکەوتنی نەتەوەییەکانو گەشتنیان بە دەسەلآتو دوورخستنەوەی کەنیسەو پاپاکان لە کاروباری سیاسەتو دەسەلآت، وەئەم تیروانینە لە ڕۆژئاواوە هێنرایە ڕۆژهەلات، بەتایبەت لە قۆناغەکانی کۆتایی دەوڵەتی عوسمانی ئەم تێڕاونینە قوڵتر بوویەوە، وە لەپێناو ئەو مەبەستەدا چەندین ڕێکخراوو گرووپ پێکهاتن کە بانگەشەی جیاکردنەوەی دینو دەسەلاتیان دەکرد، وە ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە لە ڕۆژهەلات سەرئەنجامێکی لێ دروست بوو کە جیاکردنەوەی ئیسلام لە دەوڵەت پێویستییەکی ئەم سەدەیەو بەبێ دوورخستنەوەی ئیسلام لە کاروباری سیاسی کێشەکان چارەسەر ناکرێن، بێئەوەی

جیایی بکەن لە نێوان ئیسلامو مەسیحییەتو ڕوانینی هەریەکەیان سەبارەت بە زانستو زانیاری، یان جییایی نەکردن لە نێوان دوو سەردەم کە (200) ساڵ زیاتری بەسەردا تێپەڕیوە!!، هەروەها جودایی نەکردن لە نێوان بنەماو تێڕاونینی ئیسلامو مەسیحییەت سەبارەت بە دەسەڵاتو سیاسەت، کە بێگومان ئەم جیانەکردنەوەو تێکەڵکردنە سەرئەنجامێکی هەڵەو دەرئەنجامێکی نادروستی لێ هەڵدەقوڵێت کە خاوەنەکانی دەخاتە ئەزموونێکی سەرنەکەوتوو ناکۆك، ئەم دیدو بۆچوونانە وای کرد لە عەلمانیو نەتەوەییەکانی ڕۆژهەلات کە دەست بکەنە ڕەخنەو هێرشکردنە سەر ئیسلامو تێڕوانینی ئیسلامی بە نووسینو کۆڕگێڕانو سیمینار بەستنو گفتووگۆ کردن، بەتایبەت لە سەرەتای سەدەی بیستەم کە ئەم دیاردەیە بوو بە تەوژمێکی نوێ بەتایبەت لە پاش ڕووخاندنی دەوڵەتی ئیسلامی عوسمانی ، وە بۆ کۆمەڵە نووسەرو ڕۆشنبیرێك هەستان بە بانگەشەکردن بۆ ئەو دروشمانە لەناو گەلانی موسڵماندا بە پاساوی گەیشتن بە شارستانی ڕۆژئاواو دەستخستنی سەربەستیو ئازادی بۆ گەلانی ڕۆژهەلات کە بڕوایان وابوو بە هەمان ڕەوتی ڕۆژئاوا پێویستە سیاسەتو دین لێك دوور بخرێنەوەو دین تێکەڵ بەژیانی سیاسی نەکرێت، لەو نووسەرانەش کەسەر قافلەی بڵاوکردنەوەی ئەم جۆرە ڕەخنانەبوون (عەلی عەبدوڕەزاق، تەها حسین، محمد حسنین هەیکەل، سلامە موسی، ئەبو زەید، نەزیە ئەیوبی) بوون.

ئاشکرایە کە زۆرێك لەو نووسەرانە پاش ئەزموونێکی تاڵو بەسەربردنی تەمەنێك لە سایەی ئەو بیروڕایانە پەشیمانی خۆیان دەربڕیو پاشگەزبوونەوە لە بیروڕاو تێڕوانینەکانیان، لەوانەش محمد حسنین هەیکەل بە نووسینی کتێبی (حیاة محمد) ئەو ڕاستییەی سەلماندو عەلی عەبدوڕەزاقیش لە ساڵی 1951دا پەشیمانی خۆی دەربڕی لەو بیروڕایانەی کە لە ساڵی 1925دا تۆماری کردبوون لە کتێبی (الخلافة الاسلامية)دا،وە لە چەندین چاوپێکەوتنو گفتوگۆ کە کراوە لە نێوان نووسەرو ڕۆشنبیرە میسرییەکاندا پەشیمانبوونەوەی خۆی ڕاگەیاندووە، وەتەها حسین پاش چەند ساڵێك هەستا بە چاپکردنەوەی کتێبی (الشعر الجاهلي)و ئەو (28) دێڕەی ناو کتێبەکەی کە گومانی خۆی ڕاگەیاندبوو لە چیرۆکی ئیبراهیمو دروستکردنی کەعبە لە چاپە نوێیەکەیدا لایدانو سڕییەوەو ناوی کتێبەکەشی گۆڕی بۆ (في الادب الجاهلي)، وە لەپاش کۆدەتای سەربازی بەسەر دەسەڵاتی پاشایەتی تەها حسین کرایە ئەندامی داڕشتنی دەستور وە یەکێك بوو لەو ئەندامانەی داکۆکی دەکرد لەوەی کە هەر یاسایەك لە دەستوری میسردا دژایەتی هەبێت لەگەڵ قورئاندا دەبێت هەموار بکرێت،وە بە تەواوی لەو بیروڕایانەی پێش بیست ساڵ کە تۆماریکردبوون پاشگەز بوویەوە، ئەم گۆڕانکاریە لە دیدو بۆچوونەکاندا لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەو هەڵسەنگاندنو بەدواداچووندا بووە .

بەڵام بەداخەوە پاش هەشتا ساڵ لەکۆن بوونو سکراب بوونی ئەم پڕوپاگەندەو ڕەخنانە، تازە هەندێك نووسەرو ڕۆشنبیری کورد دێنو ئەم بابەتانە وەردەگێڕنە سەر زمانی کوردی، یان هەندێك بابەتو نووسراوی لەو شێوازانە دەخەنە بازارەوە .

پاش ئەو هەموو گۆڕانکارییەی بەسەر جیهاندا هاتووە لە ڕووی سیاسیو فیکریو ڕۆشنبیرییەوە، دەبوایە ئاستی تێڕوانینو ڕەخنەی ڕۆشنبیرانی گەلی کورد زۆر لەوە بەرزتر بوایە کە تاقیکردنەوەیەکی سەرنەکەوتووی خەڵکی تر دووبارە بکەنەوە، چونکە خزمەتکردن بە گەلی کوردو نووسینی کوردیو ئاستی ڕۆشنبیریی لە کوردستان ئەوە دەخوازێت کە ڕەخنەگرتنو هەڵسەنگاندنیان بۆ ئیسلامو ئیسلامییەکان ڕەخنەیەکی بابەتیو هاوسەنگ بێتو دووربێت لە دەمارگیریو لاسایی کردنەوە، بۆ نموونە ڕەخنەگرتن لە مومارەسەی دەسەڵاتدارو خەلیفەکان کە کردوویانە بەرانبەر بە گەلەکانیان، یان ڕەخنەگرتن لە هەندێك ئیجتیهادو ڕاو بۆچوون کە لە کۆندا کراوە لە لایەن زانایانی ئیسلامیی، یان ڕەخنەی فیکریو ڕۆشنبیری لە بەرهەمی زاناو بیریارانی ئیسلامیی، یان ڕەخنە لە ڕەوتە ئیسلامییەکانی سەدەی بیست، ئەمە نەك هەرجێگەی گلەیی نییە، بەڵکو بەڵگەیە لەسەر زیندوییو هەوڵدانە بۆ گۆڕانکاریو چاکسازیکردن، ئەمەش زەرورەتێکی سەردەمەو پێویستییەکی هەنووکەییە لە پێناو بەرژەوەندی نەوەکانی ئێستاو داهاتوو، بەڵام ڕەخنەگرتن لە مەسەلەیەکی سەلمێنراوو چەسپێنراو کەنزیکەی سیازدە سەدەونیوو بە کرداری بوونی هەبووە، چ وەك دەسەڵاتو

مومارەسە، چ وەك لایەنی تیۆری‌و فیکری کە بە هەزارەها نووسراوو پرۆژەی لەسەر تۆمار کراوە، هەموو دین‌و ڕێبازەکانی تر مامەڵەی بەرجەستەییان لەگەڵ ئەو دەسەڵاتە کردووە، لەو ماوە دورودرێژەدا کەس نەهاتووە بە خەیاڵیداو شەرمەزاری بووە بۆ خاوەنەکەی گەر کەسێك بڵێت ئیسلام تێکەڵ بە سیاسەت کراوە ،یان ئیسلام سیستەمی سیاسی نییە ، چونکە کاتێك مەسەلەیەکی وا دەتوانرێت بوروژێنرێت کە لە ڕووی پراکتیکەوە ئەو ڕێبازە تاقی نەکرابێتەوەو نەسەلمێنرا بێت، وە بنەرەتی هەڵەی عەلمانییەکانی ڕۆژهەلاتیش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی بە یەك چاو سەیری هەردوو دۆخ‌و پێشهاتەکانی ڕۆژئاواو ڕۆژهەلات دەکەن، چونکە عەلمانییەت لە ڕۆژئاوادا دروست بوووە گەشەی کرد بەهۆی بوونی کێشەو گرفتیکی واقعی‌و ڕەوا کە بریتیبوو لەوەی قەشەو پاپاکان ببوونە کۆمەڵە دەسەڵاتداریکی ستەمکارو تاکڕەو، هەروەها ململانێی کەنیسە لە دژی زانست‌و زانایان، وە پێکهێنانی دادگاکانی پشکنین‌و تاوانبارکردنی هەرکەسێك هەستێت بە لێکۆڵینەوەیەکی زانستی، بەڵام گەر سەرنج بدەین لە بارودۆخی جیهانی ئیسلامی ئەو کێشانەبوونیان نەبووە لە دەسەڵات‌و کۆمەڵگای ئیسلامیدا، ئیسلام لە قۆناغە لاوازەکانیشیدا هەرگیز دژی زانست‌و زانیاری نەبووە، وە لە هەموو قۆناغە جیاجیاکانی مێژووی ئیسلامیدا چەوسانەوەی نەتەوەیی‌و دینی نەبووە، بەڵی هەندێکجار، لە هەندێك شوێن لەلایەن دەسەڵاتدارێکەوە یان سەرکردەیەکەوە دیاردەو هەڵوێستی ناڕەوا ڕوویداوە بەڵام حاڵەتێکی تاکی‌و کاتی بووە، ئەوەش دەسەلمێنرێت کەلە ڕۆژهەلات هەندێك کێشەی تری هەبووە وەك دواکەوتن لە ڕووی زانست‌و لاوازی لە ڕووبەڕووبوونەوە بەرانبەر هێرشە دەرەکییەکان، بەڵام ئەمەش هۆکەی دەگەڕیتەوە بۆ سست بوون لە جێبەجێکردنی بنەماکانی ئیسلام‌و پابەند نەبوون بە ڕێنماییەکانی، چونکە لە سەردەمی دەوڵەتی عەباسیدا ڕۆژهەلات پێشەنگ بووەو لە زۆر بواریشدا ڕۆژئاوا هەوڵیداوە سوود لە ڕۆژهەلات وەربگرێت، دەسەلاتی ئیسلامی پێشکەوتووتر بووەو ژیان‌و گوزەران‌و زانست لە ڕۆژهەلاتەوە سەرچاوەی گرتبوو .

لە کۆتاییدا پێویستە ئاماژە بەوە بکرێت کە بڵاوکردنەوەی ئەم دیدو بۆچونانە بە شێوەیەکی بەربڵاو لەم ساتەدا بەبێ پاساو نییەو ئەم ڕەخنانەش لەم ساتەدا دەگەڕێنمەوە بۆ ئەو بارودۆخە سیاسییە نوێیە کە هاتووەتە کایەوە لە ناوچەکەداو گەرم بوونی بازاری دژایەتیکردنی ئیسلام‌و ڕەوتی ئیسلامیی‌و هەوڵدان بۆ سنوردارکردنی چالاکی‌و جمووجوڵی ئیسلامییەکان، ئەم نووسینەشم وەلامێکی گشتگیرە بۆ هەموو ئەو ڕەخنەو تێڕوانینە بێبەڵگانەی بڵاودەکرێتەوە بە مەبەستی گەمارۆدانی فیکری ئیسلامی‌و لاوازکردنی قەوارەی ئیسلامییەکان بە قۆستنەوەی ئەو بارودۆخە سیاسیانەی ئێستا لە ئارادان.

هیوادارم خزمەتێکم بە نووسینی کوردی کردبێت‌و کەمێك لەو تەمومژەی سەپێنراوە بڕەوێنرێتەوەو ئومێد دەکەم ئەم نووسینەم بەرچاوڕوونییەك بێت بۆ ڕۆڵەکانی گەلەکەم بۆ گەیشتن بە هیواو ئاواتەکانیان.

**ئارام قادر**

**سلێمانی**

2007/3/2

ڕاڤەکردن و لێکۆڵینەوە لە زاراوەی (سیاسەت) لە ڕووی زمانەوانییەوە، دەروازەیەکی فراوانمان بۆ واڵا دەکات بۆ تێگەیشتن لە مەبەست و ئامانج لەم وشەیەو چۆنیەتی بەکارهێنانی و سنووری ئەو چوارچێوەیەی کە دەیگرێتەوە .

**زاراوەی سیاسەت لە ڕووی زمانەوانییەوە:**

(فەیرۆز ئابادی) دەڵێت: سیاسەت واتە: فەرماندان بە هاووڵاتیان (الرعیە) و قەدەغەکردن.

لە قاموسی (ئەکادیمیە)دا هاتووە: سیاسەت وشەیەکی (مؤنث)ە، واتە: زانینی هەرشتێك پەیوەست بێت بە هونەری حوکمکردنی دەوڵەت و بەڕێوەبردنی پەیوەندییەکانی دەرەوەی.

(ئیبن حەجەر) دەڵێت: سیاسەت واتە: پەیماندان و هەوڵدان بۆ چاککردن و ڕێککردنی کارێك.

ئیبن (منظور) دەڵێت: السوس: واتە: سەرکردایەتی کردن.

پێشەوا غەزالی پێناسەی دەکات و دەڵێت: چاککردن و چاکسازییە بە ڕێنماییکردنی خەڵك بۆ ڕێگەی دروست و ڕاست کە ڕزگارکەریان بێت لە دونیا و دواڕۆژدا.

ئیبن عەقیل پێناسەی دەکات بە: (هەستان بە هەرکارێك بۆ خەڵکی کە نزیك بێت لە چاکەو دوور بێت لە خراپەکاری گەر پێغەمبەریش ﷺ ئەنجامی نەدابێت و نیگاشی لە سەر نەهاتبێت).

شیخ عەبدولوەهاب خەلاف پێناسەی دەکات بە: (هەڵسوڕاندنی کاروباری گشتی دەوڵەتی ئیسلامی بە جۆرێك کە بەرژەوەندییەکان بێنێتە دی و زیانەکان لابدات، بە شێوەیەك کە سنورە شەرعییەکان و بنەما گشتیەکان نەبەزێنێت).

لە فەرمودەیەکی پێغەمبەر ﷺدا هاتووە: (ان بني إسرائيل كانت تسوسهم ألانبياء) واتە: "نەوەو گەلی ئیسرائیل پێغەمبەرانیان سەرکردایەتیان دەکردن، واتە: سەرپەرشتیان دەکردن".

لە (لسان العرب)دا هاتووە: (السیاسە) واتە: هەستان بە چاکسازی و ڕێککردنی کارێك.

لە ڕاڤەی وشەی سیاسەتەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە سیاسەت بریتییە (لە ئەستۆگرتنی بەرپرسیارێتی بە مەبەستی چاکسازی و ڕێکخستنی کاروباری نێوان خەڵکی بە فەرمان پێکردنیان و ڕێگەلێگرتنیان).

**سیاسەت لە ڕووی تێگەیشتن:**

تێگەیشتن لە زاراوەی سیاسەت لە ڕووی مەفهوم و ناوەڕۆکەوە ڕاوەستاوە لەسەر ئەو تێڕوانین و فیکرەیەی کە تەعبیری لێدەکات، بەڵام زۆربەی تێڕوانین و بۆچوونەکان سەبارەت بە تێگەشتنیان لە زاراوەی سیاسەت لە مەسەلەی (دەسەڵات . دەوڵەت) یەك دەگرنەوە بۆنمونە :

1. سیاسەت واتە هونەری حوکم: سیاسەت لەلای سوقرات و ئەفلاتون و ئەرستۆ زۆربەی زانایانی یۆنانی کۆن واتە: (هونەری حوکم کردن و هونەری بەڕێوەبردنی دەسەڵات)، وەك سوقرات دەڵێت: (سیاسەت واتە هونەری حوکم و ئەوەی سیاسەت بزانێت واتە: هونەری حوکم کردن دەزانێت).

2. سیاسەت واتە ململانێ لەسەر دەسەڵات: هەندێك لە گۆشەنیگای ئۆپۆزسیۆنەوە (معارضة) سەیری سیاسەت دەکەن نەك خاوەن دەسەڵاتەکان وەك (موغنثا) دەڵێت: سیاسەت واتە: "خەبات لە پێناو دەست خستنی دەسەڵات"، هەروەها تروتسکی و میکیافیلی و جورج کلاوسن لەسەر ئەم ڕایەن.

3. سیاسەت واتە هونەری بەڕێوەبردن: (هاتزفلد) و (دارمستتر) وای دەبینن کەسیاسەت (هونەرێکی ئیدارییە، واتە ڕێبازی بەڕێوەبردن و هەموو ئەو کارانە دەگرێتەوەکە پەیوەست بێت بە حوکمەوە) .

4. سیاسەت واتە هونەری هەڵخەڵەتاندن: وەك چۆن لەناو خەڵکی گشتیدا باوە کە سیاسەت واتە: فرتوفێڵ و هەڵخەڵەتاندن وەك دیزائیلی دەڵێت: "سیاسەت واتە: حوکم کردنی مرۆڤ لە ڕێگەی هەڵخەڵەتاندنیانەوە".

**مێژووی سیاسەت**

له کاتێکدا ئێمه دەمانەوێت لەسەر زاراوەی سیاسەت و مومارەسەی سیاسەت کردن بکۆڵینەوە، دەبێت له مێژووی سەرهەڵدان و قۆناغەکانی گەورەبوون و گەشەکردنی ئەم زاراوەیە بکۆڵینەوە، لێکۆڵەرەوان به تێکرِا کۆکن لەسەر ئەوەی که سیاسەت به دوو قۆناغدا گوزەریکردووە:

1. قۆناغی نەبوون: لەم قۆناغەدا هەموو زانایانی ئیسلامیی و مێژووناسان و لێکۆڵەرەوانی یاساو سیاسەت لەسەر ئەوەکۆکن که له قۆناغه سەرەتاییەکانی ژیاندا سیاسەت نەبووەو مرۆڤ ئەم زاراوەی نەزانیوەو مرۆڤایەتی پێویستی پێ نەبووە.

له سەرەتای ژیاندا دەسەڵات بوونی نەبووە، به هۆی سادەیی ژیان و کەمی ژمارەی دانیشتوان و تێك نەگیرانی بەرژەوەندییەکان و زۆری سەرچاوەکانی بژێوی، ئەم قۆناغه زانایانی ئیسلامی ناوی دەبەن به قۆناغی ژیان لەسایەی فیترەت و پاکیەتێدا (كَانَ النَّاسُ أُمَّةً وَاحِدَة) البقره-213، واته: (خەڵکی یەك نەتەوەو کۆمەڵ بوون به سروشت)، وەك زانایانی تەفسیر دەڵێن که له ئادەمەوە (سەلامی خوای لێ بێت) تا ناردنی پێغەمبەر نوح (سەلامی خوای لێ بێت) دە سەدەی خایاندووەو خەڵکی لەسەر فیترەت و راستی ژیاوە، بەڵام زانا رۆژئاواییەکان وەك( هۆبزو جان جاك رۆسۆو لۆك )ناوی دەبەن به ژیان لەژێر سایەی یاسای سروشتی دا (قانون الطبيعة).

2. قۆناغی دەرکەوتن: بەهۆی زیادبوونی ژمارەی دانیشتوان و ململانێ لەسەر بەرژەوەندییەکان و کێشە کۆمەڵایەتییەکان، پێویستی مرۆڤ به دەسەڵات سەریهەڵدا، له پێناو رێکخستنی کاروبارەکانی ژیان و پەیوەندییەکانی نێوان مرۆڤەکان و چارەسەری ئەو کێشانەی که دەهاتنه بوون به هۆی سروشتی خودی مرۆڤ و سەرهەڵدانی پێداویستییەکانی بژێوی، مومارەسەی سیاسەت و پێویستی بوونی دەسەڵات بوو به زەروورەتێکی ژیان "هەندێك له زانا رۆژئاواییەکان کۆمەڵێك تیۆر دەخەنه روو بۆ دەرکەوتن و پێویستی سەرهەڵدانی دەسەڵات و مومارەسەی سیاسەت که له چەند تیۆرێکدا دەستنیشانیان کردوون وەك:

1. تیۆری دەسەڵاتبەخشین (تفويض) لەلایەن خواوە: ئەم تێورە وای بۆ دەچێت که هەر له سەرەتای ژیانەوە دەسەڵات له لایەن خواوە بەخشراوە به کۆمەڵێك کەس و ئەوان له دەسەڵاتی خواوە ئەو دەسەڵاتەیان وەرگرتووەو به ناوی خواوە حوکمیان کردووە، نموونەش لەسەر ئەم دەسەڵاتە حوکمی سۆمەرییەکان له عێراقدا که دەسەڵاتیان لەسەر بنەمای تەفویزی خوایی بنیات نرابوو، چونکە بیروباوەڕیان وابوو که خوا پاشاو حاکمەکان دیاری دەکات و سیستەم و یاساو رێساکانی دەوڵەت له لایەن خواوە دەردەچێت، ئەم حاکمانە وەکیلی خوان لەسەر زەوی، هەروەها دەسەڵاتەکانی یۆنانی کۆن و میسرو هیندو چین لەسەر ئەم بیروباوەڕە دامەزرابوو.

2. تیۆری گرێبەستی کۆمەڵایەتی: ئەم تیورە لەسەر گریمانەیەك دامەزراوە که مرۆڤەکان له سەردەمێکدا ژمارەیان زیادی کردووەو بەرژەوەندییەکانیان تێکگیراون، بۆ رێکخستنی کاروباریان خەڵکی هاتوون گرێبەستێکیان له نێوان خۆیان و کۆمەڵێك کەسدا بەستووە که کاروباریان بۆ بەرن بەرِێوەو خەڵکیش گوێرایەڵیان بێت و پابەندبن به بریارو ئاراستەکانیان، ئەمەش بۆ کەمکردنەوەی کێشە لەسەر سەرچاوەی ئابووری و پێداویستییەکانی ژیان. ئەم تیۆرەش رای( هۆبزو لۆك و جان جاك رۆسۆیە) واته: کۆمەڵگا له هەندێك مافەکانی خۆیان چاوپۆشی دەکەن له پێناو رێکو پێککردن و بەرِێوەبردنی کاروباری بژێوی و ژیانیان له لایەن چەند کەسێکەوە بەرِێوەببرێت ، ئەوانیش له بەرانبەری ئەو ئەرکەدا مەرجی گوێرِایەڵی و پابەندبوون و رێزگرتنیان هەیە، واته: گرێبەستێکە لەنێوان دوو کۆمەڵ که هەریەکەیان کۆمەڵێك مەرج و مافیان هەیە بەسەر یەکترەوە.

3. تیۆری بنەماڵە: هەندێك له زانایان لەئەنجامی لێکۆڵینەوەیان بۆ مێژووی سەرهەڵدانی دەسەڵات گەشتوونەتە ئەوەی دەسەڵات له کۆمەڵێك بنەماڵەی بەناوبانگ و خاوەن پلەوپایە بۆ نەوەکانیان بەجێماوە لەسەر بنەمای میراتگری، چونکە دەسەڵاتیش خەسڵەتێکی مەعنەوییەو دەگوێزرێتەوە له باوکەوە بۆ نەوەکانی، هەر چۆن میراتی موڵك و ماڵ دەگوێزرێتەوە.

4. تیۆری هێز: هەندێك له زانایان ئەم تیۆرەیان لەسەر ئەوبنچینەیە دارِشتووە که لەکۆندا هەرکەس هێزی لەرووی ماددی و ژمارەی کۆمەڵگاکەی زۆرتر بووبێت خۆی فەرز کردووە به سەر خەڵکانی تر داو دەسەڵاتی سەپاندووە به سەر

ئەوانەی دەوروبەریدا، هەر چەندە ژێر دەستەکانیان ڕازیش نەبوون و پێداویستییەکانی ژیانیان بۆ فەراهەم نەهێنابن، بەڵکو بە هێزو ستەم خۆیان زاڵکردووەو هێز تەنها پێوەر بووە بۆ بوونی دەسەڵات.

5. تیۆری فاکتەرە هەمەلایەنەکان: داڕێژەرانی ئەم تیۆرە وای بۆ دەچن کە هۆکاری ئابووری‌و کۆمەڵایەتی‌و هێزو بنەماڵەو پێداویستی ژیان هۆکارو پاڵنەربوون بۆ پێکهێنانی دەسەڵات‌و مومارەسەی سیاسەت،وبە تەنها یەك فاکتەر کاریگەری نەبووە لە سەرهەڵدانی سیاسەت‌و دەسەڵات. واتە: لە یەککگرتنی هەموو فاکتەرەکان گرنگی‌و پێداویستی دەسەڵات‌و سیاسەت هاتووەتە بوون.

بەڵام لە بیروڕای ئیسلامدا سەرهەڵدانی سیاسەت‌و مومارەسەی کاری سیاسی لە ناردنی پێغەمبەرانەوە دەستی پێکردووەو دەسەڵات گرتنەدەست و بەڕێوەبردنی کاروباری خەڵك ئەرکی پێغەمبەران بووە، بەپێی ئەو پەیامەی بۆیان هاتووە لەلایەن خوای گەورەوە کە بەپێی وەزع‌و بارودۆخی ژیان گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە بۆنمونە:

1. کاتێك ژیان سادەو ساکاربووەو پێداویستی ژیان نەگەیشتۆتە قۆناغێك کە ململانێ‌و کێشمەکێشمی تێدا بێت‌و ژمارەی مرۆڤەکان زۆر کەم بوون، خوای تاك‌و تەنها پێغەمبەرانی ناردووە بۆ ئاگادارکردنەوەیان کە ئەرکیان لە دونیادا خواپەرستیەو دەبێت خوا بە تاك وتەنها بپەرستن‌و خواناسی بکەن‌و خۆبپارێزن لە ئاگری دۆزەخ‌و هەوڵبدەن بۆ دەستخستنی بەهەشت وەك لە سورەتی (البقرة)دا ئایەتی213دەفەرموویت: (كَانَ النَّاسُ أُمَّةً وَاحِدَةً فَبَعَثَ اللّهُ النَّبِيِّينَ مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِين) واتە: (خەڵکی‌و مرۆڤایەتی یەك نەتەوە بوون‌و خوای تاك‌و تەنها پێغەمبەری بۆ ناردوون تا مژدە بدات بەو کەسانەی خواناسی دەکەن‌و ئەوانەش بترسێنێ کە لە بەرنامەی خوا لادەدەن)، چونکە هەرچەندە مرۆڤیش ژمارەیان کەم بێت، بەڵام خوای میهرەبان بێ بەرنامەی نەکردوون‌و ڕێنماییی‌و ئاراستەی کردوون لە ڕێگەی پەیامی پێغەمبەرانەوە، ئەمەش بەپێی پێویستی‌و سروشتی ژیانی مرۆڤەکان لەوکات‌و سەردەمانەدا، وەك لە ژیان‌و بەسەرهاتی پێغەمبەر نوح (سەلامی خوای لێبێت) دەردەکەوێت کە قورئان بۆمان دەگێڕێتەوە: (إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ نُوحٌ أَلاَ تَتَّقُونَ) (الشعراء: 106)، واتە: (کاتێك نوحی برایان پێی وتن ئایا ناترسن لە خواو خۆتان ناپارێزن؟) یان لە دەقێکی تری قورئاندا باس لە هەڵوێستی نەتەوەی نوح دەکات لە بەرانبەر بانگەوازی خواییدا (قَالَ رَبِّ إِنِّي دَعَوْتُ قَوْمِي لَيْلاً وَنَهَاراً* فَلَمْ يَزِدْهُمْ دُعَائِي إِلاّ فِرَاراً) (نوح: 5 . 6)، واتە: (وتی: ئەی پەروەردگارم من گەلەکەی خۆمم بە پەنهانی بانگ کرد بۆ لای دینەکەی تۆ بە ڕۆژو بە شەو، تا بانگم دەکردن ئەوان زیاتر دوور دەکەوتنەوە)، بەمشێوەیە دەبینین بانگەوازو پەیامی پێغەمبەر نوح زیاتر سروشتی بانگەوازی ئامۆژگاری گشتی بووە کە لەگەڵ بارودۆخی ژیان‌و سروشتی مرۆڤایەتی لەو قۆناغەدا گونجاوە.

2– لەپاش ئەوەی ژیان لە سایەی فیترەت‌و پاکێتیدا کۆتایی هات کە زیاترلە دە سەدەی خایاندووە، قۆناغێکی نوێ هاتە بوون کە بریتییە لە (وَمَا كَانَ النَّاسُ إِلاَّ أُمَّةً وَاحِدَةً فَاخْتَلَفُواْ) (یونس: 19)، واتە: (خەڵکی لە پێشینەدا یەك نەتەوە بوون‌و لە پاشاندا ناکۆکیان تێکەوت)، ئەویش بەهۆی ئەوەی کە ژیان گەشەیکردو ژمارەی دانیشتوان لە گۆی زەویدا زیادیکرد، وە لە ئەنجامی سروشتی خودی مرۆڤەکان‌و سروشتی ژیان ململانێی دەستی پێکرد (كَلاّ إِنَّ الْإِنسَانَ لَيَطْغَى* أَن رَّآهُ اسْتَغْنَى) (العلق: 6 . 7)، واتە: (مرۆڤ سەرکەش‌و گومڕا دەبێت کە بینی بووەتە خاوەن سەروەت‌و سامان)، یان قورئان وەسفی مرۆڤ دەکات (إِنَّ الإِنسَانَ لَظَلُومٌ كَفَّار) ابراهيم . 34، واتە: (مرۆڤەکان ستەمکارو سپلەن)، وە هەروەها وەسفی دەسەڵاتداران دەکات کە چۆن لە ڕابردوودا هەڵسوکەوتیان کردووە لەگەڵ گەلانی ژێر دەستیاندا، (قَالَتْ إِنَّ الْمُلُوكَ إِذَا دَخَلُوا قَرْيَةً أَفْسَدُوهَا وَجَعَلُوا أَعِزَّةَ أَهْلِهَا أَذِلَّةً وَكَذَلِكَ يَفْعَلُونَ) النمل34، واتە: (بە ڕاستی پادشاو دەسەڵاتداران هەرکات بە زۆر چوونە شارێکەوەو دەسەڵاتیان بەسەریدا پەیداکرد گەندەڵی‌و گێرەشێوێنی بڵاودەکەنەوەو لە کاتێ زاڵبووندا هەر بەو جۆرە دەکەنەوە)، لەگەڵ گەشەکردنی ژیان لەسەر ڕووی زەوی‌و ئاڵۆزبوونی پێداویستییەکانی‌و تێکەڵبوونی بەرژەوەندییەکان‌و پێکهاتنی هۆزو عەشیرەت‌و دروستبوونی گوندو شارو نەژادە جیاجیاکان، خوای گەورە ئەرکی پێغەمبەرانی زیاتر کرد، هاوکات لەگەڵ پەروەردەی دەرون‌و پاککردنەوەی ڕۆح، سەرپەرشتی گەلان‌و بەڕێوەبردنی کاروباریان خراوەتە ئەستۆی پێغەمبەران، وەك لە قورئاندا ئاماژە بە ئەرکی پێغەمبەر ئیبراهیم دەکات (وَإِذِ ابْتَلَى إِبْرَاهِيمَ رَبُّهُ بِكَلِمَاتٍ فَأَتَمَّهُنَّ قَالَ إِنِّي جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَاماً..) البقره . 124، واتە: (بیربکەنەوە کاتێك خوا ئیبراهیمی تاقیکردەوە بە

چەند بڕیارو فەرمایشتێك كە ئەویش بەجێی هێنان، خوا پێی فەرمووو بێگومان من تۆ دەكەمە پێشەوای خەڵكی)، بەمشێوەیە دەبینین كە ئەرك و كاری پێغەمبەران تەنها لە ئامۆژگاریو ڕێنمایی لەبواری ئاكاروخواناسیەوە گۆڕانكاری بەسەرداهات بەگریدانی خواناسی ودەسەلات بەیەكەوەو ڕێنمایكردنی مرۆڤ لە هەردوو بوارەكەدا ، بۆ هەمان مەبەست پێغەمبەرمان ﷺ ئاماژە دەكاتو دەفەرمووێت: (ان بني اسرائيل كانت تسوسهم الانبياء، كلما هلك نبي خلفه نبي وانه لانبي بعدي، انه سيكون خلفاء) بوخاریو ئیمام ئەحمەدو ئیبن ماجه ڕیوایەتیان كردووە، واتە: (گەلانی ئیسرائیل لەلایەن پێغەمبەرەكانیانەوە كاروباریان ڕێكخراوەو سەرپەرشتییان دەكرا،هەرپیغەمبەریك كۆچی دوایی دەكرد خوای تاك وتەنها پێغەمبەرێكی تری بۆ دەناردن،وە لەپاش من پێغەمبەر نانێردرێت لەلایەن خواوە، بەڵكو جێنشینەكان جێگەم دەگرنەوە )، لە قورئانی پیرۆزدا خوای گەورە چەند نموونەیەكی بۆ باسكردووین، تا لە واقعی ئەرك و كاری پێغەمبەران بگەین كە تەنها كاریان تەزكیەی لایەنی ڕۆحی مرۆڤەكان نەبووە، كە تەنها هەوڵی پەیوەستكردنی مرۆڤەكان بدەن بە خواوەو ئەركی پەرستشی خواوەندیان فێر بكەنو ئیدی حەقی كاروباری دونیای خەڵكیان نەبێت" بە پێچەوانەوە لە پاش ئەو گەشەكردنەی كە ژیانی مرۆڤایەتی بە خۆیەوە بینی پەیامی پێغەمبەران جودایی نەكردووە لە نێوان چاككردنی ژیانی دونیاو هەوڵدان بۆ دەستخستنی ڕۆژی دوایی"، پەیامی پێغەمبەران لە هەموو سەردەمەكاندا ئەوەیان دووپات كردووەتەوە كە ئەو پەیامەی لەلایەن پەروەردگارەوە بۆیان هاتووە بەرنامەی ژیانی دونیاو سەرفرازی ڕۆژی دوایی تێدایە"، (لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ وَأَنزَلْنَا الْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ..) (الحديد: 25)، واتە: (سوێند بە خوا بە ڕاستی ئێمە پێغەمبەرانی خۆمانمان ناردووە بە بەڵگەو موعجیزەی ڕوونو ئاشكراوە، كتێبو تەرازووی دادمان پێدا ناردوون بۆ ئەوەی خەڵكی بە دادگەری ڕەفتار بكەن لە ناو خۆیاندا، ئاسنمان دروستكردووە كە هێزو تینی تێدایە بۆ كاتی جەنگو سوودی تری تێدایە بۆ خەڵكی)، بەڵام چۆنییەتیو شێوازی مومارەسەی سیاسەت ودەسەلات لە پێغەمبەرێكەوە بۆ پێغەمبەرێكی تر گۆڕاوو جیاواز بووە، بۆ نموونە :

1. هەندێك لە پێغەمبەران مومارەسەی كاری سیاسیان كردووە لەدەسەلاتداو خۆیان ڕاستەوخۆ دەسەلاتیان گرتووەتە دەستو مومارەسەی فیعلی كاری سیاسیان كردووە وەك:

پێغەمبەر سولەیمان كە پادشاو سەرۆك بووە، خوای بەدەسەلات ناردوویەتیو كردوویەتی بە پێغەمبەر بۆ گەلەكەی، پێش ئەویش پێغەمبەر داود هەمان ڕۆڵی بینیوە، (وَحُشِرَ لِسُلَيْمَانَ جُنُودُهُ مِنَ الْجِنِّ وَالْإِنسِ وَالطَّيْرِ فَهُمْ يُوزَعُونَ) (النمل: 17)، واتە: (كۆكرایەوە بۆ پێغەمبەر سولەیمان هەموو سەربازەكانی لە جنۆكەو مرۆڤو باڵندە، بەڕیز دەڕۆشتن)، (وَوَرِثَ سُلَيْمَانُ دَاوُودَ) (النمل: 16)، واتە: (سولەیمان بووە میراتگری داوود لە پێغەمبەرایەتیو پادشایەتیو زانیاریدا).

2. پێغەمبەر هەبووە كە لەدەسەلاتدا نەبووەو خۆی داوای پلەوپایەی دەسەلاتی كردووەو داوای كردووە تێكەڵ بە سیاسەتو مومارەسەی سیاسی ببێت، وەك پێغەمبەر یوسف (سەلامی خوای لێ بێت) كە خۆی هەوڵیدا بڕواتە دەسەلاتو لە دەسەلاتدا خزمەت بكات (قَالَ اجْعَلْنِي عَلَى خَزَآئِنِ الأَرْضِ إِنِّي حَفِيظٌ عَلِيمٌ* وَكَذَلِكَ مَكَّنَّا لِيُوسُفَ فِي الأَرْضِ يَتَبَوَّأُ مِنْهَا حَيْثُ يَشَاء) (یوسف: 55 . 56)، واتە: (پێغەمبەر یوسف فەرمووی بە پاشا خەزنەو دارایی میسرم پێ ڕاسپێرە با ببمە سەرپەرشتیاری، چونكە من شارەزاو پارێزەری دەبم، بەوشێوەیە پلەو پایەمان بەخشیە یوسف لەسەر زەوی بە جۆریك لە هەر شوێنێكی میسردا بیویستایە دەژیا) (رَبِّ قَدْ آتَيْتَنِي مِنَ الْمُلْكِ..) (یوسف: 101)، واتە: (ئەی پەروەردگارم بە ڕاستی تۆ هەندێك لە دەسەلاتو پاشایەتیت پێ بەخشیوم).

3. پێغەمبەریش هەبوو لە ڕێزی موعارەزەو ئۆپۆزسیۆندا بووەو هەوڵیداوە كە گەلەكەی ڕزگار بكات لە ژێردەستەیی و چەوسانەوە،وە هەوڵی داوە شۆڕش بەرپا بكات تا خۆیان دەسەلات بگرنە دەست، چونكە لە بنەڕەتدا ئەركی دەسەلاتداران بەڕێوەبردنی خەڵكو خزمەتكردنە بە خەڵك، وە خوا كەمرۆڤی خولقاندووە بۆ ئەوە نییە كە بچەوسێنیرێتەوەو بكرێتە كوێلە، بەڵام ئەو دەسەلاتدارانە لەوكاتانەدا دەستیان داوەتە ستەمو خراپەكردن لەناو گەلانی خۆیاندا، یاریان بەپاشەڕۆژی هاوولاتیان كردووە، چەندین نەتەوەو گەلانییان ژێردەستەو زەلیل كردووە، وەك خوای بەدەسەلات بۆمان

دەگێڕێتەوە سەبارەت بە فیرعەونی میسر کە چۆن بووە لەگەڵ میللەتکەیدا ((إِنَّ فِرْعَوْنَ عَلاَ فِي الأَرْضِ وَجَعَلَ أَهْلَهَا شِيَعاً يَسْتَضْعِفُ طَائِفَةً مِّنْهُمْ يُذَبِّحُ أَبْنَاءهُمْ وَيَسْتَحْيِي نِسَاءهُمْ إِنَّهُ كَانَ مِنَ الْمُفْسِدِينَ) (القصص: 4)، واتە: (بە ڕاستی فیرعەون بەرزو زاڵبووە لە زەوی میسردا، گەلی میسری کردە چەند بەش و کۆمەڵێکەوە، هەندێکیانی لاوازو ژێردەستە کرد بە جۆرێك کە کوڕانیانی سەردەبڕیو ئافرەتانی دەهێشتنەوە بۆخزمەتکاریو دەیکردنە کەنیزەك، بە ڕاستی فیرعەون لە خراپەکاران بووە) کاتێك خوای تاكو تەنها پێغەمبەرێکی بە پەیامێکەوە ناردووە بۆ لای ستەمکارێکی دەسەڵاتدارو گەلێکی چەوساوە تەنها بۆ ئەوەی نەناردووە کە خوای خۆیان بپەرستنو کاریان بەژیانو گوزەرانی خەڵکەکەوە نەبێت" بەڵکو شۆڕشیا ن بەرپا کردووە دژی ئەو ستەمکارو ملهوڕانەی کە خەڵك دەچەوسێننەوەو مافیان پێشێل دەکەن، خوای تاكو تەنها دژایەتی ستەمکارانی کردووەتە یەکێك لە ئەرکەکانی پێغەمبەرانو داوای کردووە لە هەموو نەتەوەکان کە هەوڵبدەن و دژی ستەمی دەسەڵاتدارەکان بووەستن، نموونەش لەو بوارەدا کاتێك خوا پێغەمبەر موسا و هارونی ناردەلا ی فیرعەون بۆ ڕزگارکردنی گەلی جوولەکە لە دەست زۆرداریو ستەمی فیرعەون (فَأْتِيَاهُ فَقُولاَ إِنَّا رِسُولاَ رِبِّكَ فَأَرْسِلْ مَعَنَا بَنِي إِسْرَائِيلَ وَلاَ تُعَذِّبْهُمْ) (طه: 47)، واتە: (ئەی موساو هارون بچنە لای فیرعونو پێی بڵێن بێگومان ئێمە هەردووکمان نێراوی پەروەردگاری تۆین، نەتەوەی ئیسرائیل ئازاد بکەو بابێن لەگەڵ ئێمەدا، ئازارو سزایان مەدە)، لەپاش شۆڕشکردنو هەوڵدان بۆ بەگژاچوونی ستەمکارو دەسەڵاتدارانی ملهوڕ جوولەکە دەسەلات دەگرنە دەستو دەبنە خاوەن حکومەتو بڕیار بەدەست بۆ کاروباری خۆیان، (وَلَقَدْ آتَيْنَا بَنِي إِسْرَائِيلَ الْكِتَابَ وَالْحُكْمَ وَالنُّبُوَّةَ وَرَزَقْنَاهُم مِّنَ الطَّيِّبَاتِ وَفَضَّلْنَاهُمْ عَلَى الْعَالَمِينَ) (الجاثية: 16)، واتە: (سوێند بە خوا بێگومان بەخشیمان بە نەتەوەی ئیسرائیل پەیامو حوکمڕانیو پێغەمبەرایەتی، ڕۆزیمان پیێ بەخشین لە خواردنی حەڵاڵو پاك، ڕێزمان لێنان بەسەر جیهانیاندا)، ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە نەك تەنها ئاینی ئیسلام، بەڵکو ئاینەکانی پێش ئیسلامیش خاوەن پەیامێکی سیاسی بوونو بەرنامەی حکومەتو کاری دەسەڵاتو فەرمانڕەوایەتیان هەبووە، وەك نەوەی ئیسرائیل کە ژێردەستەو چەوساوە بوون، بەڵام لەپاش ناردنی پێغەمبەر موساو بە ڕابەرایەتی ئەو پێغەمبەرە شۆڕشیان کردووەو بوونەتە خاوەن دەوڵەتو فەرمانڕەواییو خواش دەستوری بۆ ناردوون کە تەوراتەو پێغەمبەرانی بۆ ناردوون کە سەرپەرشتیان بکەنو کاری دەوڵەتو فەرمانڕەوایەتییان بۆرێك بخەن، مێژووش ئەوەمان بۆ دوو پات دەکاتەوە کە چەندین سەدە جوولەکەکان خاوەن دەوڵەتو فەرمانڕەوایەتی ئیمپراتۆریەتێکی گەورەبوون لە فەلەستینو دەوروبەری تا نەبوخوزنەسر هێرشی کردە سەریانو دەوڵەتەکەی ڕوخاندن،وە مەسیحییەکان چەندین سەدە گەورەترین ئیمپراتۆریەتیان هەبووە، پاش ئەوەی یەکێك لە قەیسەرەکانی ڕۆما وازی لە بتپەرستی هێناو بووە شوێنکەوتەی مەسیح لە ڕۆما،وە حوکمی زۆربەی وڵاتانی ئێستایان کردووە لەسەر بنەمای دین و ئینجیل کراوەتە یاساو دەستوور. کەواتە: لەم بەڵگانەوە دەگەینە ئەو دەرئەنجامەی کە پەیامی پێغەمبەرانی پێش موحەممەدیش کە بۆ کاتێکی دیاریکراوو سنوورێکی دەستنیشان کراو بووە پەیوەست بووە بە سیاسەتەوە، سیستەمی سیاسی دیارو ئاشکرای هەبووەو تەنها پەیامێکی ڕۆحی نەبووە بۆ ناساندنی خواو بەجێهێنانی دروشمە ئیسلامییەکان.

4- زنجیرەی پێغەمبەرایەتی کۆتایی پێهات بەوەی خوای گەورە موحەممەدی کوری عەبدوڵڵای هەڵبژاردو پەیامی پێغەمبەرایەتی بۆ ناردو ڕایگەیاند کە موحەممەدی کردووەتە کۆتا پێغەمبەرو قورئانی کردووەتە دواپەیام، بڕیاریدا ئیسلام کۆتا دینو بەرنامەی ژیان بێت لەلایەن پەروەردگارەوە، (إِنَّ الدِّينَ عِندَ اللّهِ الإِسْلاَمُ) (ال عمران: 19) واتە: (بە ڕاستی دینو ڕێبازی پەسەندکراو لە لای خوا ئیسلامە)، زنجیرەی پێغەمبەرایەتی بە محمد کۆتایی هات (مَّا كَانَ محمد أَبَا أَحَدٍ مِّن رِجَالِكُمْ وَلَكِن رَسُولَ اللَّهِ وَخَاتَمَ النَّبِيِّينَ) (الاحزاب: 40)، واتە: (محمد باوکی هیچ لە پیاوەکانتان نییە، بەڵکو ئەو نێراوی خواو کۆتاهەمینی پێغەمبەرانە)، ئەم پەیامە لە کۆتایی ژیانی پێغەمبەر محمد تەواوو کامڵ کرا، وەلە هەموو ڕووەکانی تیۆرییو پراکتیزەکردن تێرو تەسەل بوو، ڕێسای بۆهەموو بوارەکانی ژیان داڕشت (الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الإِسْلاَمَ دِيناً) (المائدة: 3)، واتە: (ئەمڕۆ ئاینەکەتانم بۆ تەواوو کامڵ کردن، چاکەو بەهرەی خۆمم ڕشتووە بە سەرتاندا، ڕازی بووم کە ئیسلام ئاینتان بێت)، خوای گەورە فەرمانی کرد بە هەموو مرۆڤایەتی کە پەیڕەوی ئیسلام بکەن وەك بەرنامەی ژیانی دونیا، کە نێراوە لە لایەن پەروەردگارەوەو هەموو شوێنکەوتەی ئاینەکانی تریشی بێدار کردووەتەوە کە دەبێت هەموو پابەندبن بەو سیستەمو شەریعەتەی محمدو شەریعەتەکانی تر دەبێت

بپێچرێنەوە، ((قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْاْ إِلَى كَلَمَةٍ سَوَاء بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلاَّ نَعْبُدَ إِلاَّ اللّهَ وَلاَ نُشْرِكَ بِهِ شَيْئاً وَلاَ يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضاً أَرْبَاباً مِّن دُونِ اللّهِ فَإِن تَوَلَّوْاْ فَقُولُواْ اشْهَدُواْ بِأَنَّا مُسْلِمُونَ) (آل عمران: 64)، واتە: (ئەی خاوەن پەیامە ئاسمانییەکان، وەرن بۆ لای وتەیەکی ڕاست کە لە نێوان ئێمەو ئێوەدا هەیە کە ئەویش ئەوەیە جگەلە خوا کەسی تر نەپەرستین‌و هیچ شتێك نەکەینە هاوەڵ‌و هاوبەشی خوا،وە لە نێو خۆماندا هەندێك بە چاوی خوایەتی سەیری هەندێکی تر نەکات‌و نەیکاتە خواو پەروەردگاری خۆی، گەر پشتیان لەو بانگەوازە هەڵکرد ئێوە ڕای بگەیەنن‌و بڵێن کە ئێوە بە شاهیدبن ئێمە بەندەو گوێرایەڵی خواین)، پێغەمبەر بە کردەیی هەستا بە چەسپاندنی ئەو پەیامەو ئیسلامی کردە بەرنامەی ژیانی دونیا لە هەموو ڕوویەکی سیاسی‌و ئابوری‌و کۆمەلایەتی‌و خواپەرستی، وەرای گەیاند کە لەپاش ئەویش دەبێت هەموو کاروبارەکان بەپێی دەقەکانی قورئان‌و ڕێنماییەکانی محمد بێت، وەك لە قورئاندا ئاماژەی پێدەکات (فَلاَ وَرَبِّكَ لاَ يُؤْمِنُونَ حَتَّىَ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لاَ يَجِدُواْ فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجاً مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُواْ تَسْلِيماً) (النساء: 65)، واتە: (سوێند بە پەروەردگارت باوەڕیان نییە هەرچەند وا خۆنیشان دەدەن، وە بروادار نین تا تۆ نەکەنە دادوەرو حاکم لە هەر ئاژاوەو دووبەرەکییەکدا کە لە نێوانیاندا ڕوو دەدات، وە لە پاش حوکم دەرکردنت نابێت هەست بە نیگەرانیی بکەن بەرانبەر بەو بڕیارەی تۆ داوتە، دەبێت بە تەواوی ملکەچی بنوێنن)، بۆ دووپاتکردنەوەی ئەم ڕاستییەش قورئان دەفەرمویت: (فَإِن تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللّهِ وَالرَّسُولِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ ذَلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلاً) (النساء: 59)، واتە: ( گەر دووبەرەکیی‌و ناکۆکیتان هەبوو لە کاروبارتاندا پێویستە بیگێڕنەوە بۆلای خواو پێغەمبەری خوا، گەر ئێوە بڕواتان هێناوە بەخواو ڕۆژی دوایی، ئەوە باشترە بۆ خۆتان و ئاکامی چاکتریشی دەبێت).

پاش گوزەرکردن بەم دەروازەیەدا دەڕۆینە ناو ئەو باس‌و مەسەلەیەی کە مەبەستەو لە پێناویدا ئەم نووسراوەم ئامادەکردووە ئەویش لە چەند پرسیارێکدا دەیخەمەڕوو:

. ئایا ئیسلام کەدوا بەرنامەو پەیامی خوایە تەنها بوارەکانی خواناسی ورەوشت دەگریتەوە ؟یان بواری سیاسیشی لە خۆگرتووە؟

. ئایا لە ئیسلامدا جوداکردنەوە هەیە لەنێوان کاروباری سیاسی‌و خواناسی؟

. ئایا بە چ پێوەرێك دەبێت ئەوە بسەلمێت کە ئیسلام سیاسەتی تێدایەو خاوەن فەرهەنگێکی سیاسی سەربەخۆیە؟

. ئایا سیاسەت لە ئیسلامدا بوونی هەیە یان ئیسلام بە سیاسی دەکرێت‌و تێکەڵ بە سیاسەت کراوە بۆ کۆمەڵە مەرام‌و ئامانجێك؟

. پرۆژەی سیاسی ئیسلامی تەنها بۆ قۆناغ‌و گەلێکی دیاریکراوە یان هەمیشەیی‌و شیاوە بۆ هەموو سەردەم‌و گەلان بە گشتی؟

. ئایا لە ئیسلامدا بنەماکانی دەسەلاتێکی سیاسیی هەیە؟

ئەم پرسیارانەو چەندین پرسیاری تریش لەوانەیە خولیای خوێنەری کوردی بێت‌و منیش هەوڵ دەدەم بە شێوەیەکی زانستی‌و دوور لە دەمارگیری لێکۆڵینەوەیەکی بابەتیی پێشکەش بکەم، بە هیوای دەرخستنی ڕاستییەکان‌و ڕەوینەوەی گومانەکان‌و لادانی ئەو تەمو مژەی دروستکراوە بەرانبەر بە مێژووو حەقیقەتی ئیسلام.

گەر لێکۆڵینەوە لە بنەما و تێڕوانینی هەر ئایدۆلۆژیاو بەرنامەیەك بکرێت بێ دەمارگیریو ڕق لێبوونەوە، دەبێت لە ڕوانگەی خودی سەرچاوەکانی ئەو بەرنامەو مێژووی چەسپاندنی ئەو پەیامەو لە خامەی بیریارو زانایانی ئەو ڕێبازە لێکۆڵینەوەو هەڵسەنگاندن بکرێت، پاشان دەتوانرێت حوکمێکی دادپەروەرانە بدرێت بەسەر ئەو ڕێبازو بەرنامەیەدا – لەراستیدا ستەمکردنە لە هەر بەرنامەو ڕێبازێك کە لە ڕوانگەی عەقڵیەتی ناحەزانییەوە بخوێنرێتەوە یان حوکمی بەسەردا بدرێت، بەبێ خوێندنەوەیەکی زانستی سەرچاوەکانی ئەو بەرنامەیە، لێکۆڵینەوەو هەڵسەنگاندن لە سەرچاوە دژەکانی هەر بیروڕایەك سەرئەنجامەکەی کەوتنە هەڵەو نەگەشتنە بە مەبەست، وە هەروەها شیکردنەوەو ڕاڤەی دەقەکانی هەر دینو بیروباوەڕێك لەلایەن کەسانێکەوە بکرێت کە خۆیان هەڵگری ئەو دینو بەرنامەیە نەبنو مومارەسەی دروشمەکانی نەکەن، سەرئەنجامەکەی نادروستو ناکۆك دەبێت، یان لێکۆڵینەوە لە دینو بەرنامەیەك گەر لە ڕوانگەی سەرچاوە بنەڕەتیەکانیەوە نەبێت ناتوانین لێکۆڵینەوەیەکی زانستی وبابەتی پیشکەش بکەین، بۆنموونە: لێکۆڵینەوە لە مەسیحییەت نابێت لە ڕوانگەی نووسەرێکەوە وەربگیرێت کە هیچ لە ئینجیل نەزانیت، یان شارەزای دینە ئاسمانییەکانی تر نەبێت، یاخود کەسێك بیەوێت لێکۆڵینەوە لەسەر فیکرو بەرنامەی سەرمایەداری یان سۆسیالیستی بکات بەوە نابێت چەند پەڕاوێكو بابەتێکی ڕەخنەگرانەی ئەو بیروڕایانە بخوێنێتەوە، ئەوە بە لێکۆڵینەوەی زانستی دانانرێتو هەر حوکمێك بدریت سەرئەنجامەکەی هەڵەدەبیت، بەهەمان شێوە لە سەردەمی ئێستاشدا بۆ لێکۆڵینەوە لە شارستانیەتیك، دەبێت زانیاری تەواو هەبیت سەبارەت بە ڕێساو یاسای ئەو شارستانیەتە، خویندنەوەیەکی ورد بکریت لەبواری مێژووی دامەزراندنو قۆناغەکانی گەشەکردنو ئەو کێشانەی هاتوونەتە بەردەم دروستبوونی ئەو شارستانیەتە،وەپاشان ئەو چەمکانە هەموو بەیەکەوە هەڵسەنگێنرێن، ئەوکات لێکۆڵینەوەو هەڵسەنگاندنێکی زانستیت دەستدەکەوێت لەمەر ئەو شارستانیەتە، ئیسلامیش وەك بەرنامەیەکی جیهانیو هەمەلایەن، تێکرا سەرچاوەی خۆی هەیە بۆ هەڵگرانیو ناحەزانی، سەرچاوەکانیش نهێنیو شاراوە نین، بۆ هەموو کەسێك هەیە کە لێکۆڵینەوەیان لەسەر بکاتو بیان خوێنێتەوە، جا بۆ شارەزایی بوون بێت یان بۆ ڕەخنەگرتن، بەڵام ئەوەی بۆ لێکۆڵینەوەو هەڵسەنگاندنی سەرچاوەکانی ئیسلام پێویستە بریتیە لە بوونی زانست بەو سەرچاوانە، چونکە ئەو سەرچاوانە زانستو تایبەتمەندێتیی خۆی هەیە،وبەخوێندنەوەیەکی سەرپێی کەس ناتوانیت بانگەشەی شارەزابوون لە ئیسلام بکات،و ئەو کەسە ناتوانێت دەست بکاتە هەڵسەنگاندنو حوکمدان، یان خوێندنەوەی هەندێك بابەتی ڕەخنەئامێز کە لە ئیسلامو مێژووی ئیسلامیی گیراوە، بێ گەڕانەوە بۆ سەرچاوەکانی ئیسلام نابێتە هەڵسەنگاندنی خودی ئیسلام، یان خوێندنەوەی چەند نووسراوێکی ئیسلامیی بە خوێندنەوەی پەیامی ئیسلامی دانانریت ئێستاش سەرچاوەکانی لێکۆڵینەوە لە ئیسلام دەخەینەڕوو:

## سەرچاوەکانی پەیامی ئیسلامی

مەبەست بە سەرچاوەکانی بیروڕاو پەیامی ئیسلامی ئەو سەرچاوە شەرعییانە دەگرێتەوە کە دەتوانرێت حوکمە شەرعییەکانو بنەما ئیسلامییەکانی لێوەربگیرێت لە هەموو بوارەکانی ئیسلامدا، لەرووی خواناسیو سیاسیو ئابوریو کۆمەڵایەتیو ....هتد، ئەویش دەکرێت بەدوو جۆر سەرچاوەوە: سەرچاوە بنەڕ کان، سەرچاوە پاشکۆییەکان.

## سەرچاوە بنەڕەتییەکان

بریتیین لەو دوو سەرچاوە سەرەکییە متمانەپێکراوەی کە پێمانگەیشتوون، لە زاناو پێشینانمانەوە، لەلایەن زانا باوەڕپێکراوەکانی ئێستاو ڕابردوو کۆدەنگیان لەسەرەو هەموو پسپۆڕانی شەریعەتو فیکری ئیسلامیی و موسڵمانان بە تێکرا یەکدەنگن لەسەر ئەو دوو سەرچاوەیە، لە سەرتاسەری جیهاندا جێگەی ناکۆکیو گفتوگۆ نەبوون، هەموو لایەك یەکدەنگو یەك ئاڕاستەن لەم مەسەلەیەدا کە ئەو دوو سەرچاوەیەش (قورئانو سوننەت)ن.

### یەکەم: قورئان

یەکەم سەرچاوەی ڕەسمیو بێهاوتای ئیسلامە کە لەلایەن پەروەردگارەوە نێراوەتە خوارەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ ((إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا عَلَيْكَ الْقُرْآنَ تَنزِيلاً) (الإنسان: 23)، واتە: (بێگومان ئێمە قورئانمان بۆ ناردیتە خوارێ بە ناردن بە شێوەی بەش

بەش)، بۆ هەموو مرۆڤایەتی هاتووە تایبەت نییە بە نەژادو گەلێکەوە (وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلاَّ كَافَّةً لِّلنَّاسِ بَشِيراً وَنَذِيراً) (سبأ: 28)، واتە: (ئێمە تۆمان نەناردووە مەگەر بۆ هەموو مرۆڤایەتی نەبێت بە مژدەدەرو ترسێنەر)، دوا پەیامە لەلایەن خواوە بۆ مرۆڤایەتی نێرراوەو جێگەی پەیامو بەرنامەکانی تری پێش خۆی گرتووەتەوە (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ أُوتُواْ الْكِتَابَ آمِنُواْ بِمَا نَزَّلْنَا مُصَدِّقاً لِّمَا مَعَكُم) (النساء: 47)، واتە: (ئەی ئەوانەی پەیامی ئاسمانیتان پێ بەخشراوە بڕوا بهێنن بەو قورئانەی ناردومانە بۆتان کە بەڕاست دانەری ئەو تەوراتەی ئێوەیە)، خوا پەیمانی داوە کە ئەو قورئانە پارێزراو بکات لەلایەن خۆیەو کەس ناتوانێت دەستکاری بکاتو بیگۆڕێتو بیشێوێنێت (إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُون) (الحجر: 9) واتە: (بێگومان هەر ئێمە قورئانمان ناردووەتە خوارەوە بۆتان وە بەراستی هەر ئێمەش دەیپارێزین)، ئەمەش سیفەتێکی بنەرەتی قورئانە کە لە پەیامەکانی پێش قورئاندا نەبووەو پەیامو بەرنامەکانی تری پێش ئیسلام توانراوە دەست کاری بکرێتو گۆڕانکاری تێدا بکرێتو بەناوی خواوە چەندین شتی تری تێکەڵ بکرێت، وەك لە ئینجیل و تەوراتدا گۆڕانکاری کراوەو قورئان ئەم ڕاستیەمان بۆ دەخاتە ڕوو: (مِّنَ الَّذِينَ هَادُواْ يُحَرِّفُونَ الْكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِ ) (النساء: 46)، واتە: (هەندێك لە جوولەکەکان فەرمودەو قسەکانی خوا دەگۆڕن لە شوێنو مەبەستی خۆی)، وەسیفەتێکی تری قورئان ئەوەیە کە باس لە هەموو بوارەکانی ژیان دەکاتو هەرشتێك کە پێویست بێت بۆ مرۆڤو دەورووبەری ئاماژەی پێ کراوەو ڕوونکراوەتەوە (مَّا فَرَّطْنَا فِي الكِتَابِ مِن شَيْءٍ) (الانعام: 38) واتە: (هیچ شتێکمان فەرامۆش نەکردووە لەم کتێبەدا کە قورئانە)، قورئان چاکترین دەستوورو بەرنامەیە بۆ هەموو گەلانی سەر گۆی زەوی (إِنَّ هَـذَا الْقُرْآنَ يِهْدِي لِلَّتِي هِيَ أَقْوَمُ) (الإسراء : 9)، واتە: (بە ڕاستی ئەم قورئانە ڕێنموێی دەکات بۆ ڕێبازو بەرنامەیەك کە ڕاسترینە)، بەڵام سیمای ئەم دەستورە ئەوەیە کە تەنها هێڵەگشتییەکان دەستنیشان دەکات، ئاڕواتە ناو وردەکاریی بابەتەکانەوە، بنەماگشتییەکانی حوکمەکان دیاری دەکاتو بواری هێشتووەتەوە بۆ مرۆڤەکان کە لە ڕێگەی عەقڵو زانستو بیرکردنەوەوە یاساو ڕێسای هەمەچەشنەی لەسەر دەربهێنن بەپێی وەزعو بارودۆخو تواناو پێداویستی مرۆڤایەتی، قورئان چوارچێوەیەکی دیاری کردووە کە مرۆڤەکان لەو چوارچێوەیەدا هەموو پێداویستیو بەرژەوەندییەکانی ژیانی مروڤایەتی تێدا ڕەچاوکراوەو مرۆڤەکانی ئازاد کردووە کە لەو چوارچێوەیەدا بجووڵێنو کاربکەن، بەڵام سنوری داناوەو قەدەغەی کردووە کە ئەو سنورە ببەزێنرێت: (تِلْكَ حُدُودُ اللّهِ فَلاَ تَقْرَبُوهَا) (البقرة: 187) واتە: (ئەمانە سنورە دیاریکراوەکانی خوان نزیکیان مەکەون)، دەستنیشانکردنی ئەو سنورەش بۆ بەرژەوەندی مرۆڤەکان، (وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَآئِثَ) (الاعراف: 157) واتە: (شتە پاكو خاوێنەکانیان بۆ حەڵاڵ دەکات وە شتە خراپو پیسەکانیان لێ قەدەغەو حەرام دەکات).

**پرۆگرامی قورئان**

بە شێوەیەکی گشتیی ئەوەی کە لە قورئاندا باس کراوە بەسەر سێ تەوەرەدا دابەش دەکرێت:

تەوەرەی یەکەم:– بیروباوەڕ: باس لە بنەماکانی باوەڕبوونو پایەکانی ئیمان بەخواو ڕۆژی دواییو پێغەمبەران وپەیامەکانیانو فریشتەو قەزاو قەدەرو ئەوەی پەیوەست بێت بە ئیمانو بەشەکانییەوە ڕوون کراوەتەوە، بۆنمونە، (وَالْمُؤْمِنُونَ كُلٌّ آمَنَ بِاللّهِ وَمَلآئِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ) (البقرة: 285)، واتە: (بڕواداران هەموو بڕوایان هێناوە بە خواو فریشتەکانیو پەیامەکانیو پێغەمبەرانی).

تەوەرەی دووەم:– ئاکارو ڕەوشت: ڕوونکردنەوەی ئەو ئاکارو ڕەوشتانە دەگرێتە خۆ کە پێویستە مرۆڤ پێوەی پابەندبێت بەرانبەر خۆیو دەورووبەرىو وازهێنان لەو ڕەوشتو ئاکارانەی زیانبەخشە بە خودی مرۆڤو کۆمەڵگا بۆنموونە (وَلَا تَجَسَّسُوا وَلَا يَغْتَب بَّعْضُكُم بَعْضا) (الحجرات: 13)، واتە: (سیخوری مەکەنو بەدوای ناتەواوی یەکتردا مەگەڕێنو لەپاشملە بە خراپە باسی یە کتری مەکەن).

تەوەرەی سێیەم:– بنەما کرداریەکان (العملية): بریتییە لەو هێڵە گشتیو بنەمایانەی باس لە هەڵوێستو کردارەکانی مرۆڤ دەکەن، کە پەیوەست بن بە خواو مرۆڤ و دەورووبەری لە ڕووی کۆمەڵایەتیو ئابوریو سیاسیو هەرکارێك پەیوەست

بێت بە بەرژەوەندییەکانی مرۆڤو ڕێکخستنی هەڵسوکەوتی لەسەر ڕووی زەوی، تەوەرەی سێیەم پەیوەستە بە بابەتەکەی ئێمەوە، لەبەر ئەوە بە کورتی ئاماژە بەو هێڵەگشتیانە دەکەین کە لەم تەوەرەیەدا باس کراون کە بریتین لە:

1– هێڵە گشتییەکانی خواپەرستی: کە بریتییە لە دەستنیشانکردنی ئەو دروشمانەی لەسەر مرۆڤ پێویستە بیکات بۆ دروستکردنی پەیوەندی نێوان خواو بەندەکانیو بەجێهێنانی بەندایەتی بۆ خوا، وەك نوێژو ڕۆژوو دروشمەکانی تر، بۆ نموونە (وَأَقِيمُواْ الصَّلاَةَ وَآتُواْ الزَّكَاةَ) واتە: (نوێژ بکەنو زەکات بدەن) لە تەوەرەی سێیەمدا سەرنج دەدەین سەرەتاو بنچینەی هێڵە گشتییەکان بە پەیوەندی مرۆڤو پەروەردگاری دەست پیدەکات بەلام هێڵەگشتییەکانی تر هەموو پەیوەستە بە شێوازو بنەماکانی دەسەلاتو جۆرەکانی دەسەلاتو یاسا جۆربەجۆرەکانی ژیان، کە شێوازەکانی دەسەلاتو سیمای دەسەلاتی ئیسلامیی کاملو تەواو دەکەن، مەبەستیش لەمەدا ئەوەیەکەبناغەی دەسەلاتی ئیسلامی دەبێت لە پەیوەندی نێوان پەروەدگارو بەندەکانییەوە بنیات بنرێتو ئەمەش خاڵی جەوهەریو جیاوازی نێوان دەسەلاتی سیاسی ئیسلامییە لەگەڵ دەسەلاتەکانی تردا، چونکە لەبەرنامەی ئیسلامدا گۆڕانکاری لە ناخەوە دەست پێدەکات (إِنَّ اللّهَ لاَ يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّى يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنْفُسِهِم) (الرعد: 11)، واتە: (بە ڕاستی خوا بارو حالی هیچ گەلێك ناگۆری تا ئەوان بارو حالی خۆیان نەگۆڕن) فەلسفەی حوکم لە ئیسلامدا لێرەوە دەست پیٚ دەکاتو ئەوە دووپات دەکاتەوەکە ئیسلام لە حوکمو دەسەلاتدا تەنها مومارەسەو کەسەکان ناگۆڕێت، بەڵکو گۆڕانکارییەکی ڕیشەیی دەکاتو گۆڕانکاری ناخی مرۆڤو دەروونی دەکاتە بناغە بۆ ئەو گۆڕانکارییە گشتگیرە، چونکە هەموو گۆڕانکارییەکانی تر لەسەر دڵو ناخی مرۆڤ بنیات دەنرێتو گەر ناخی مرۆڤەکان پەروەردە بکرێت وپێبگەیەنرێت لەسەر دڵسۆزیو خزمەتکردنو خۆشەویستیو قەناعەت کردنو دونیا نەویستی ئەوا لە میکانیزمو هەڵسوکەوتەکانی تردا گۆڕانکاری تر دێتە دی، بەڵام هەر چەندە میکانیزمو سیستەمو فەلسەفەی حوکم بگۆڕێت بەڵام ناخی مرۆڤەکان پەروەردە نەکرابێتو ڕاهاتبن لەسەر خۆویستیو پاراستنی بەرژەوەندی تاك ودوونیا وویستی، سەرئەنجامەکەی بریتی دەبێت لە گەندەڵیو فەسادو ستەمو خراپەکاری.

2– هێڵە گشتییەکانی خێزان: بریتیە لە بنەماکانی پێکهینانی خیزانو دەستنیشانکردنی مافو ئەرکی ژنو پیاو، وەچۆنییەتی پەیوەندی هەریەکەیانو ڕێکخستنی کاروباری خیزانی بۆنموونە (وَآتُواْ النَّسَاء صَدُقَاتِهِنَّ نِحْلَةً فَإِن طِبْنَ لَكُمْ عَن شَيْءٍ مِّنْهُ نَفْساً فَكُلُوهُ هَنِيئاً مَّرِيئا) (النساء: 4) واتە: (بیدەنە ئافرەتەکان خۆیان نەك کەسوکارییان مارەییەکانیان وەك بەخشین نەك لە بری کریٚ، ئینجا ئەگەر بەدڵ پێیانخۆش بوو بەشێك لەو مارەییەی خۆیان ببەخشن بە ئێوە ئەو کات بیخۆن بە خۆشیو بە حەڵاڵی)، دەقەکانی ئەم هێڵە گشتیانە ئاماژە بە هەموو یاساکانی باری کەسیەتی دەکەن لەبواری بنیاتنانی خێزانو جۆری پەیوەندی نێوان ژنو پیاودا .

3– هێڵە گشتییەکانی سیستەمی ئابوری ودارایی: چۆنییەتی پەیوەندی نێوان تاکەکانی کۆمەڵگا لە ڕووی داراییەوەو بنەماکانی پەیداکردنی دارایی دروستو یاساکانی ئابوری لەم هێڵە گشتییانەدا ئاماژەیان پیٚ کراوە، بۆنموونە (وَأَحَلَّ اللّهُ الْبَيْعَ وَحَرَّمَ الرِّبَا) (البقرة: 275)، واتە: (خوای گەورە بواری داوە بە کڕینو فرۆشتنو سوود (سوو)ی قەدەغە کردووە).

4. هێڵە گشتییەکانی دەستوور: ئەو بنەما سەرەکییانەی دەسەلاتی لەسەر بنیات دەنرێتو ئەرکو مافی هەریەکە لە دەسەلاتدارانو هاووڵاتیان لەم هێڵە گشتیانەدا دەستنیشانکراوە، بۆنموونە (وَشَاوِرْهُمْ فِي الأَمْرِ) (ال عمران: 159)، واتە: (ڕاوێژییان پیٚ بکە لە کاروبارەکاندا).

5. هێڵە گشتییەکانی پەیوەندییە نێودەوڵەتییەکان: شێوازی مامەڵە لەگەڵ دەوڵەتی هاوپەیمانو ئەو هێزانەی دەستدرێژی دەکەنە سەر قەوارەی ئیسلامیو بنەماکانی جەنگو ئاشتی لەم بەشەدا روونکراونەتەوە ، بۆنموونە: (وَإِن جَنَحُواْ لِلسَّلْمِ فَاجْنَحْ لَهَا وَتَوَكَّلْ عَلَى اللّهِ) (الانفال: 61)، واتە: (ئەی محمد ئەگەر ئەوانە کە دوژمنتن مەیلو ویستی ئاشتییان هەبوو تۆش مەیلی بکەو دەست بۆ ئاشتی دریژ بکە، پشت بەخوا قایم بکە).

6. هێڵە گشتییەکانی تاوانو سزا: جۆری تاوانەکانو سزاکانیو شێوازی جێبەجێکردنیو هۆکاری سەرهەڵدانی تاوانو چۆنییەتی کەمکردنەوەی تاوانەکان لەم بەشەدا ئاماژەی پێکراوە، بۆنموونە: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ كُتِبَ عَلَيْكُمُ

الْقِصَاصُ فِي الْقَتْلَى) (البقرة: 178)، واتە: (ئەی ئەوکەسانەی بڕواتان هێناوە پێویست کراوە لەسەرتان تۆڵەسەندن لە کوژراواندا بە یەکسانی).

لەم سەرچاوەیەدا بۆ هەریەك لە هێڵە گشتییەکان نموونەیەکمان هێناوەتەوە تا بابەتەکەمان لە مەبەستی خۆی لانەدا، ئەوکەسەی دەیەوێت زیاتر لەم بوارەدا شارەزابێت دەتوانێت بگەڕێتەوە بۆ سەربەشی موعامەلات لە سەرچاوە فقهییەکاندا، نموونەی زیاترو بەڵگەی زۆرتر ئاماژەیان پێ کراوە. ئەوەی لە پرۆگرامی قورئاندا بۆمان ڕوون دەبێتەوە ئەوەیە کە ئیسلام مرۆڤو ژیانو دەسەڵات بەیەکەیێکی تەواوکەر دادەنێتو هیچیان جودا ناکاتەوە لەویتر، بایەخدان بە بیروباوەڕو بنیاتنانی عەقیدەیەکی دروست بۆ ئەوەیە کە مرۆڤ بزانێت بۆ چ مەبەستیك لەم ژیانەدا خولقینراوەو بۆ چ ئامانجێك هاتووەتە بوون کە بریتییە لەخواپەرستیو خواناسی لەژیاندا (وَمَا خَلَقْتُ الْجِنَّ وَالْإِنسَ إِلاَّ لِيَعْبُدُونِ) (الذاريات: 56)، واتە: (من کە خوای ئێوەم جنۆکەو مرۆڤم بۆ ئەوە خوڵقاندووە کە بەندایەتی من بکەن)، بایەخدان بە ڕەوشتو ئاکارەکان لە قورئاندا بۆ ئەوەیە کە ئاماژەبێت بۆ ئەو دەسەڵاتەی کە بنیات دەنرێت دەبێت لەسەر بناغەی ڕەوشتو ئاکاری بەرزو جوان بێت، چونکە هەموو چەمکەکانی تری ژیان گەر ڕەوشتو ئاکاری لەگەڵدا نەبێت بێ ناوەرۆكو بێ گیان دەبێتو لەسەر بناغەیەکی ناڕێك بنیات دەنرێت، ئەوەش وادەکات کە سەرئەنجامی داڕوخانو تیاچوون دەبێت وەك شاعیری عەرەبی ئەحمەد شەوقی دەڵێت:

إنما الأمم الأخلاق ما بقيت فإن هم ذهبوا أخلاقهم ذهبوا

. پاشان بایەخدان بە دروشمەکانی خواپەرستیو جێبەجێکردنیان بۆ ئەوەیە کە مرۆڤ هەمیشە لە پەیوەندییەکی بەردەوامو بەهێزدا بێت لەگەڵ پەروەردگاریدا، بەردەوام ڕۆحیەتی مرۆڤەکان جۆش بدرێت بە خواناسییو لەخواترسانو خۆشەویستی خوا ،تا لە کاتێکدا مرۆڤ هەڵدەستێت بە ئەنجامدانی کاری دەسەڵاتو فەرمانڕەوایەتی لەسەر بنەمای دادگەریو خزمەت گوزاری کاربکات،و سامان ومالّو پلەو پایە فریوی نەدات،وە ڕوونەکاتە ستەمو چەوسانەوە، لە تەوەرەکانی تردا گەر سەرنج بدەین دەبینین دەقەکانی قورئان چەندین سیستەمو بنەماو یاسای دەسەڵاتی تێدایەو دەیسەلمێنێت قورئان خاوەن بەرنامەیەکی کاملّو تەواوو گشتگیرە لە بواری دەسەڵاتی سیاسیو هەموو جۆرە یاساکانی تری پەیوەست بە ژیان، بە جۆرێك کە ژیان بەرەو ئاسوودەییو کامەرانیو دادگەری ببات گەر بەشێوەیەکی دروستو تەواو جێبەجێ بکرێت، ئەم ڕاستییەش لە لێکدانەوەی زاراوەی (دین)دا دوویات دە بیتەوە، زانایان کە ڕاڤەی زاراوەی دینیان کردووە بە پێی دەقەکانی قورئانو فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ، کە بە چەند ماناو واتایەك هاتووە یەکێك لە ماناکانی دین بەوە کراوە کە (کە دین زاراوەیەکی گشتگیرو هەمەلایەنەیە (جامع وشامل) مەبەست پێی سیستەمو یاسایەکی هەمەلایەنەی ژیانە کە مرۆڤ تێیدا ملکەچ دەبێت بۆ دەسەڵاتێكو گوێرایەڵی دەکاتو پەیڕەوی لەو دەستوورو یاساو ڕێوڕەسمەی ئەودەسەڵاتە دەکات)، نموونەش لەسەر ئەم ڕاستییە خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرموویت: (ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ) (الروم: 30) واتە: (ئەوەیە ئاینی ڕاستو تەواوو دروست بەڵام زۆربەی خەڵکی نازاننو بیر ناکەنەوە).

**دووەم: سوننەت**

سوننەتی پێغەمبەر بریتییە لە هەموو ئەو گوفتارانەی بە سیفەتی پێغەمبەری فەرموویەتی یان ئەو کردارانەی کە لە لایەن پێغەمبەرەوە ﷺ ئەنجامدراوە بۆ ڕێنماییو ڕوونکردنەوەی پەیامی ئیسلامەتی، یان بێدەنگبوونی بەرانبەر کردووەو هەڵوێستێك یان بە چاك زانینی هەر کارێك لە لای ئەودا کرابێت، یان لە پاشاندا ئاگادار کرابێتەوە، ئەم شێوازانەی هەڵسوکەوتو گوفتارانەی پێغەمبەر ﷺ بە سوننەت ناو دەبرێتو سەرچاوەی دووهەمی پەیامی ئیسلامییەو یەکێکە لە سەرچاوە بنەڕەتیو پشت پێبەستراوەکان، خوای تاكو تەنها بەدەقی قورئان ئاماژەی بەوە کردووە کە دەبێت فەرمانەکانی پێغەمبەر ﷺ جێبەجێ بکرێتو دووربین لە قەدەغەکراوەکانی، وەك دەفەرمووێت: (مَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ

فَانتَهُوا) (الحشر: 7)، واته: (ئەوەی پێغەمبەر بۆتان دەستنیشان دەکاتو بۆتان دەهێنێت وەریبگرن، ئەوەی لێتانی قەدەغە دەکات وازی لیٚ بهێنن).

رۆڵی فەرموودەکانی پێغەمبەریش ﷺ سەبارەت بەشیتەڵکردنو ڕاڤەکردنی قورئان لە چەند خاڵێکدا دەخەینەڕوو:

1. ڕوونکردنەوەو شیتەڵکردنی ئەو هێڵە گشتیانەی لە قورئاندا بە کورتی ئاماژەیان پیٚ کراوە، وەك خوا دەفەرموویت: (وَآتُواْ الزَّكَاةَ)، پێغەمبەر ﷺ هەستاوە بە دەستنیشانکردنی شێوازو چۆنییەتی زەکاتدانو دەستنیشانکردنی ڕێژەو بەرنامەی کۆکردنەوەو چۆنییەتی مامەڵە لەگەڵ ئەم بنەمایە بۆ بەڕێوەبردنی دەسەلاٚت، واتە: پێغەمبەر ﷺ هەستاوە بە دانانی هەنگاوە کردارییەکانو شێوەی چەسپاندنی ئەو یاسایانەی بەکورتی ئاماژەیان پێکراوەو دانانی ڕێسای گونجاو بۆیان.

2. دووپاتکردنەوەی هەندێك مەسەلەی گرنگ کە لە قورئاندا ئاماژەیان پێکراوە، بەلاٚم پێغەمبەر ﷺ بە فەرموودەکانی دووبارەی کردوونەتەوە بۆ زیاتر بایەخ پێدانو بە گرنگ گرتنو شێوازی مامەڵە لەگەڵ ئەو بنەما قورئانییەدا. بۆنموونە لە ڕووی ئابوورییەوە بۆ پاراستنی ماڵو موڵکی خەڵكو دەستدرێژی نەکردنە سەرشتومەكو سامانی خەڵك دەفەرمووێت: (لایحل مال امرء مسلم الا بطیبةمن نفسه) واتە: (دروست نییە ماڵو موڵکی موسڵمانێك بۆ موسڵمانێکی تر مەگەر بە ڕەزامەندیو لەسەر ویستی خۆی بێت)، دەقی ئەم فەرموودەیە بۆ دووپاتکردنەوەی دەقێکی قورئانی هاتووە کە دەفەرمویٚت: (وَلاَ تَأْكُلُواْ أَمْوَالَكُم بَيْنَكُم بِالْبَاطِلِ) (البقرة: 188)، واتە: (ماڵو موڵکی یەکتر مەخۆن لەنێو خۆتاندا بەناڕەوا)، دووبارەکردنەوەی ئەو بنەمایانە لەلایەن پێغەمبەری خواوە ﷺ کە لە قورئاندا دەستنیشانکراوە بۆ ئەو مەسەلە گرنگو بایەخدارانەیە کە مرۆڤ بەردەوام پێویستی پێیەتیو کاریگەری هەیە لەسەر ژیانو مرۆڤ وەك مەسەلەکانی دارایی، ئاکار،...هتد.

3. دەستنیشانکردنی هەندێك بنەماو ئەحکام کە لە قورئاندا ئاماژەیان پیٚ نەکراوە، بۆنموونە لە دەسەلاٚتی دادگاییدا کە یەکێکە لە جۆرەکانی دەسەلاٚت قورئان تەنها باسی لەدوو شاهید کردووە، وەك وەسیلەیەکی ئیسپات، بەلاٚم پێغەمبەر ﷺ حوکمی کردووە بەیەك شاهیدو سوێندێك یان لە یاسای باری کەسێتیدا لە قورئاندا باس لە قەدەغەکردنی هێنانی دوو خوشك دەکات بۆ پیاوێك، بەلاٚم پێغەمبەر ﷺ ئەوەشی دەستنیشان کردووە کە دروست نییە پیاو ئافرەتو پوری بهێنێت یان ئافرەتو خاڵۆژنی بخوازێت.. هتد.

4. ڕاڤەکردنی قورئان کە هەندێك بنەماو دەق هەبووە پێغەمبەر ﷺ خۆی ڕاڤەی کردووە تاخەڵکی بەوشێوەیە لە دەقەکان بگەنو بەوشێوەیەش جێبەجیٚ بکرێت، چونکە ئەوە یەکێکە لە ئەرکە گرنگەکانی پێغەمبەرایەتی، وەك خوا دەفەرمویت: (وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِم) (النحل: 44). واتە: (قورئانیشمان بۆ تۆ ناردووە ئەی محمد بۆ ئەوەی ڕوونی بکەیتەوە بۆ خەڵکی ئەوەی بۆیان نێردراوەتە خوارەوە).

لێرەدا چەند نموونەیەك لە فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ دەخەینە ڕوو وەك ئاماژەیەك کەدەقەکانی سوننەت ڕێساو یاساکانی دەسەلاٚت لە خۆ دەگرێت:

1. لە عائیشەوە گێڕدراوەتەوە: (أن النبي اشترى طعاما من يهودي الى أجل ورهنه درعا من حديد) بوخاری ڕیوایەتی کردووە. واتە: (پێغەمبەر ﷺ خواردنێکی کڕی لە جوولەکەیەك قیمەتەکەی دواخست تا کاتێکی دیاریکراو لە بەرامبەردا قەڵغانێکی ئاسنی دانابە ڕەهن ) کە ڕێنمایی کردنە لە بواری یاسای مەدەنی سەبارەت بە ڕێساکانی ڕەهن کردن.

2. پێغەمبەر ﷺ دەفەرمویٚت: (لا يؤخذ الرجل بجناية ابيه) نەسائی ڕیوایەتی کردووە، واتە: (پیاو تۆڵەی لیٚ ناسەنرێتەوە لە ئەنجامی تاوانکردنی باوکی) کە ئەمەش یەکێکە لە ڕێساکانی سزاو تاوان کە بریتیە لە سیستەمی بەرپرسیاری تاوانو تاوانی کەسێك ناخرێتە ئەستۆی کەسێکی تربا پەیوەستی خوێن یان خزمایەتیش هەبێت لە نێوانیاندا.

3. پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (لعن الله الراشي والمرتشي في الحكم) تورموزی ڕیوایەتی کردووە، واتە: (خوا نەفرین دەکات لەوکەسانەی بەرتیل وەردەگرن‌و بەرتیل دەدەن لە دادوەری کردندا) کە ئەمەش یەکێکە لە سیستەمەکانی دەستەڵاتی دادگەری لە پێناو پاراستنی دەسەڵاتی دادگایی بە شیوەیەکی سەربەخۆو بێدەست تێوەردان.

4. پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (تعوذوا بالله من امارة الصبيان) ئیمامی ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە، واتە: (پەنا بگرن بە خوا لە سەرۆکایەتی کردنی منداڵان) کە یەکێکە لە سیستەمەکانی دەسەڵات کە ئەویش مەرجی بالغ بوونە لە کاتی هەڵبژاردنی سەرۆك‌و نابێت منداڵ بکرێتە سەرۆك‌و خەلیفە هەرچەندە ڕاوێژکارو زانای لە چواردەور کۆبکرێنەوە.

5. پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (خير النكاح ايسره) ئەبوداود ڕیوایەتی کردووە، واتە: (چاکترین مارەبڕین ئاسانترینیانە)، کە ئەمەش یەکێکە لە سیستەمی باری کەسیەتی‌و ڕێنمایی کردن سەبارەت بە سوککردنی مارەیی‌و گران و قورس نەکردنی لە پێناو هاندانی لاوان بۆ پێکهێنانی خێزان.

کەواتە لێرەدا سوننەت بەڵگەیەکی تر دەخاتە سەر بەڵگەکانی تری قورئان کە ئیسلام خاوەن بەرنامەیەکی تیۆری سیاسییەو پێغەمبەریش ﷺ هاتووە بۆ چەسپاندنی ئەو بەرنامەیە بە کرداری‌و تەرجەمەکردنی بۆ واقیعی ژیان‌و شیتەڵکردن‌و ڕاڤەکردنی ئەو هێڵە گشتیانەی کە دانراون بۆ ئەو سیستەمە سیاسییە ئەمەش وەك نموونەیەکی بەرجەستە بۆ ئەوانەی کە پاش پێغەمبەر ﷺ دێن‌و دەیانەوێت سیستەمی سیاسی ئیسلامی بچەسپێنن.

**سێیەم: سەرچاوە پاشکۆییەکان**

پەیامی ئیسلامی لەبەر ئەوەی پەیام‌و بەرنامەیەکە بۆ هەموو نەوەو نەژادە یەك لەدوایەکەکان‌و گشتگیرە بۆ هەموو شوێنەکان،و هەموو لایەنەکانی ژیانی مرۆڤ دەگرێتەوە ،جگە لەو سەرچاوە بنەڕەتی‌و سەرەکیانە کۆمەڵێك سەرچاوەی پاشکۆیشی هەیە، گرنگی سەرچاوەپاشکۆییەکان لەوەدایە کەهۆکاریکن بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەوڕاڤەکردنی سەرچاوە بنەڕەتییەکان‌و چۆنییەتی جێبەجێکردنیان‌و چۆنیەتی مامەڵەلەگەڵ بارودۆخە نوێیەکان‌و دانانی چارەسەر بۆ هەر پێش هاتێك کە لە داهاتوودا دێتە کایەوەو دابینکردنی چارەسەر بۆ هەمووڕووداوەکان،وە دانانی یاسای گونجاو بۆ پێداویستی ڕۆژانەی هەموو ڕەگەز‌و نەژادەکان، ئەم سەرچاوە پاشکۆیانەش لەلایەن زاناو بیریارانی ئیسلامی دانراون بە پشت بەستن بە دەقەکانی قورئان‌و ڕێنماییەکانی سوننەت، سەرچاوە پاشکۆییەکان دابەشدەکرێت بۆ دوو جۆر:

1- سەرچاوە پاشکۆییە نەقڵییەکان (ئیجماع)و (عورف).

2- سەرچاوە پاشکۆییە عەقڵییەکان (قیاس، مەصلەحەت، ئیستحسان، زەریعەتکردنەوەو داخستن، و...هتد.

نموونە لەسەر عورف لە کاروباری دبلۆماسی‌و سیاسی پاراستن وریزلینان لە نوێنەرو نێراوی وڵاتان‌و دەسەڵاتەکانی تربە شێوەیەکی گشتی‌و بەتایبەت لە کاتی جەنگ‌و ناکۆکیدا، با ئەو نوینەرو نێراوەش دوژمن‌و ناحەز بن، ئەم هەڵوێست وهەڵسوکەوتە لە دەسەڵاتی ئیسلامییدا لەسەر بنەمای عورف ئەو کاتە کاری پێکراوەو ڕێز لە نوێنەرو نێراوەکانیان گیراوەو بە سەلامەتی بەڕێکراون، هەروەك کاتی شکاندنی پەیمانی حودەیبیە ئەبوسفیان هاتە مەدینە بۆ گفتوگۆو پاساو هێنانەوە بۆ پێغەمبەرو نوێنەرانی دەسەڵاتی ئیسلامی.

نموونە لەسەر ئیجماع زانایان کۆڕان لەسەر ئەوەی کە کچی برا وەك کچی مردوو وایە بۆمیرات لە کاتێدا مردوو خۆیی کوڕو کچی نەبوو.

نموونە لەسەر قیاس لە یاسای باری کەسێتیدا زانایان فتوایان داوە کە وەسیەت بۆ کراو مەحروم دەکرێت لە بەشی وەسێتەکە گەر هەستا بە کوشتنی ئەو کەسەی وەسیەتەکەی بۆ کردووە، ئەمە قیاس کراوە لەسەر بنەمای میراتگر میرات نابات لەو کەسەی میراتی لێ دەبات گەر هەستا بەکوشتنی.

نموونە لەسەر مەصڵەحەت لە بواری یاسای مەدەنی، ئیلزامکردنی خاوەن عەقارێك کەواز لە موڵکەکەی بهێنێت لە پێناو بەرژەوەندی گشتێدا بەرانبەر تەعویزێك کە دەیدرێتێ.

نموونە لەسەر ئیستحسان بۆ کاروباری دەسەڵاتی دادگا، لەلایەن زانایانی ئیسلامییەوە ڕێگەیان داوە کە شاهید گەر لەبەر پاساوێکی شیاوو دروست نەیتوانیبێت بۆ شایەتیدان دەتوانێت نوێنەر بنرێت لە جیاتی خۆی بۆ شایەتیدانەکە.

نموونه لەسەر زەریعەکردنەوەو داخستنی لە بواری یاسای تاوان و سزادا کردنەوەو هەڵدانەوەی گۆڕ کە لە بنەڕەتدا دروست نییەو دەبێت ڕێز لە مردوو بگیرێت، بەڵام زانایان ڕێگەیان داوە گۆڕ هەڵبدرێتەوە گەر بۆ کەشفکردنی جۆری تاوان و هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی تاوانبارو بەدواداچوون بێت.

ئێمە لەم باسەماندا ڕۆناچینە ناو سەرچاوە پاشکۆییەکان، چونکە ئەو بابەتە نووسین و شوێنی خۆی هەیە، وەهەرکەس بیەوێت زانیاری زیاتری لەم بارەوە هەبێت دەتوانێت لە سەرچاوەکانی زانستی ئوسوڵی فقهدا لەو مەسەلانە زیاتر بکۆڵێتەوە، لە ئەنجامی ئەم خوێندنەوە خێرایە بۆ سەرچاوە پاشکۆییەکان دەردەکەوێت کە ئیسلام خاوەن گەورەترین سەرمایەی یاسایی و دەستوریە بۆ دەسەڵات و سیستەمی سیاسی، هیچ بەرنامەیەکی تر نییە کە بەو شێوەیە خاوەن فەرهەنگ و ئەدەبیاتی سیاسیی و یاسای خۆی بێت کە یاساو بنەمای لەسەر هەموو کاروبارێکی ئەم ژیانە تێدایە لە ئاستی تاک و کۆمەڵگاو دەسەڵاتدا.

خاڵێکی تر کە بۆمان ڕوون دەبێتەوە ئەو ڕاستییەیە کە ئیسلام تەنها یەك سەرچاوەی دەستوری و کاری سیاسی نییە، بەڵێ قورئان بە سەرچاوەی یەکەم و بە سەرچاوەی بنەڕەتی دادەنرێت بەڵام تەنها سەرچاوە نییەو سەرچاوەکانی تری وەك سوننەت و ئیجماع و قیاس و مەصلحەت و..هتد، کە زۆرتر پەیوەستن بە ئیجتهادو ڕای زانایان و پسپۆڕانی مەیدانە جیاجیاکان کە ڕۆڵی گەورەیان هەبووە لەدانان و داهێنانی ئەم سەرچاوانەداو بە هەموو ئەو سەرچاوانەش کانیاوی سیستەمی ئیسلامی پێکدەهێنن.

بەم شێوەیە سەرچاوەکانی دەستوری ئیسلام پێکدێت لە دوو جۆر، جۆرێکیان دەق و نیگای خواییە، جۆرێکیان عەقڵ و بیرکردنەوەو زانست و ئەزموونە، لە ئەنجامی یەکگرتنی ئەم دوو جۆرە سەرچاوەیە ئیسلام بووەتە دەوڵەمەندترین بیروباوەڕ سەبارەت بە سەرچاوەی کاری سیاسیی و دەسەڵات، ئەو کەسەی دەیەوێت لێکۆڵینەوە لە ئیسلام بکات تائەو ڕاستییەی بۆ ڕوون بێتەوە کە ئایا ئیسلام ئایینێکە تەنها پەیوەندی بە ڕۆحی مرۆڤو دروستکردنی پەیوەندی نێوان خواو بەندەکانیەوە هەیە؟ یان بەرنامەیەکی تەواو تێرو تەسەلە لە ڕووی بنەمای سیاسیی و بوونی میکانیزمی چەسپاندن و گونجانی بۆ جێبەجێکردن لە واقعی ژیاندا، لێکۆڵەرو ئەو کەسەی عەودالی ڕاستیە پێویستە سەرچاوە بنەڕەتییەکانی ئیسلام بخوێنێتەوەو لێکۆڵینەوەش لە سەرچاوە پاشکۆییەکانی ئیسلام بکات و بەسەرپێیی و بە خوێندنەوەی چەند نووسراوێکی ڕەخنەئامێز کە لە ئیسلام گیراوە ناتوانریت حوکم بدرێت لەم بابەتە هەستیارەدا، بەڵکو ئەو کەسانەی دەیانەویت بگەنە حەقیقەت پێویستە لێکۆڵینەوەو خوێندنەوەی سەرچاوەکانی خودی ئیسلامی بکەن و ئەم سەرچاوانەش پێویستیان بە زانستی تر هەیە بەتایبەت زانستی قورئان و تەفسیر بۆ تێگەیشتن لە سەرچاوەی یەکەم و زانستی فەرموودەو ڕاڤەکردنی بۆ تێگەیشتن لە سەرچاوەی دووهەم و زانستی ئوصولی فیقهو فیقهی ئیسلامی بۆ تێگەیشتن لە سەرچاوە پاشکۆییەکان کە هەموو ڕاستییەکانی تێدا ڕۆشن دەبێتەوە، ئەو کاتە با حوکم بدرێت و بڕیار بدرێت کە ئایا ئیسلام بە سیاسی کراوەو سیاسەت تێکەڵ بە ئیسلام کراوە یان ئیسلام خاوەن فەرهەنگێکی تەواوی سیاسییە، هەرچۆن بەرنامەی خواپەرستی و جێبەجێکردنی هەندێك دروشم و ئاکاری دیاری کردووە بە هەمان جۆر یاساو ڕێسای سیاسەتی ئیسلامی دەستنیشان کردووەو جێبەجێ کردنیشی فەرز کردووەو کەمتەرخەمانیشی لۆمە کردووەو بە تاوانباری داناون.

پاش ئەوەی لە ڕووی تیۆرییەوە لێکۆڵینەوەمان کرد سەبارەت بە سەرچاوەکانی ئاینی ئیسلام، پاش ڕوون بوونەوەی چوارچێوەو بەرنامەو تێڕوانینی سیاسیو دەسەڵات لەو سەرچاوانەوە، هەموو کەسێك کە عەوداڵی ڕاستی بێتو بیەوێت مەسەلەکان بە شێوەیەکی زانستیانە بسەلمێنێت بۆی دەردەکەوێت لە ڕووی تیۆریو بەرنامەوە، ئیسلام خاوەن قوتابخانەیەکی سیاسیی سەربەخۆی دیاری کراوەو بنەماو ڕێسای تایبەتی هەیە، بەڵام بۆ ئەوەی لێکۆڵینەوەو هەڵسەنگاندنمان بابەتیانە بێت نابێت تەنها لە ڕووی تیۆرییەوە ئەم مەسەلەیە باس بکرێت، بەڵکو پێویستە ئەم مەسەلەیە گرێ بدرێت بە مێژوویشەوە تا بزانرێت بەرنامەی سیاسی ئیسلام تا چەند گونجاو بووەو توانراوە بچەسپێنرێت، چونکە گرنگی بەرنامەو تێڕوانینەکان لەوەدانییە کە تەنها بوونیان هەبێت، بەڵکو لەوە گرنگتر ئەوەیە کە لە واقعیدا بتوانرێت بچەسپێنرێتو لە ئەزموونی تاقیکردنەوەشدا سەرکەوتن بەدەست بهێنێت، جا بۆ بەدیهێنانی ئەم مەبەستە ئێستا گوزەرێکی خێرا دەکەین سەبارەت بەمێژووی سەرهەڵدانو قۆناغەکانی ئەم ئاینە تابزانین ئایا ئیسلام بەرنامەیەکی سیاسی هەیە؟! یان ئیسلام تێکەڵکراوە لەگەڵ سیاسەت؟! یان ئاین وەك هۆکارێکی سیاسی بەکارهاتووە بۆ گەشتن بە چەند ئامانجێك؟

پێش ئەوەی بڕۆینە ناو مەسەلە مێژوویەکان پێویستە ئاماژەیەك بکەین بەمانای دەسەڵاتو بنەماکانی دەسەڵات لە زانستی یاساو یاسای دەستوری، وەشێوەی دەسەڵاتو بنەما زانستییەکانی دەخەینە ڕوو کە ئێستا لە زۆربەی زانکۆکانی جیهان دەخوێنرێتو هەموو زانایان لەسەری کۆکن، بەڵام بەشێوەیەکی کورتو ناڕۆینە ناو هەندێك کێشمەکێشمی ناو زانایان سەبارەت بە ناکۆکییان لەسەر هەندێك زاراوەو چۆنییەتی ماناو مەفهومەکەی، بەڵکو بە شێوەیەکی گشتی باسی لێوە دەکەین.

دەوڵەت پێناسەکراوە بە: (کۆمەڵە تاکێك کە چالاکی ئەنجامدەدەن لە سنورێکی جوگرافی دیاریکراوداو ملکەچن بۆ سیستەمێکی دەستنیشان کراو).

**پایەکانی دەوڵەت:**

1. گەل: کۆمەڵە خەڵکێکە کە لەسەر سنورێکی جوگرافی دیاریکراو بە شێوەیەکی بەردەوام نیشتەجێیە.

2. هەرێم: ئەو پارچەزەویەیە کە ئەو کۆمەڵە خەڵکەی تێدا نیشتەجێ بووە، وەمەبەستمان لەهەرێم بەهەموو جۆرەکانیەوە (زەمینی، ئاوی، ئاسمانی).

3. دەسەڵاتی سیاسی: ئەو سیستەمەیە کە گەل ملکەچ دەبێت بۆی لە کاروباری ڕۆژانەیدا، یان ئەو هێزەیە سروشتێکی یاسایی هەیە کە ماف دەداتە هەڵسوڕێنەرانی بڕیار دەربکەن کە سیفەتی ئیلزامی هەبێتو بۆیان هەبێت سزای خەڵك بدەن لە ئەنجامی جێبەجێ نەکردنیاندا.

**تایبەتمەندییەکانی دەوڵەت:**

1. سەروەری (سیادە): بریتیە لەوەی کە دەسەڵاتی دەوڵەت دەسەڵاتێکی باڵایەو فەرمانبەدەستەو ئیرادەی خۆی فەرز دەکات بەسەر خەڵکیدا لە ڕێگەی ئەو کارو کردەوەو هەڵوێستانەی دەینو و دەبێت جێبەجێ بکرێت لەلایەن تاکەکانەوە.

2. کەسایەتی یاسایی (الشخصیة القانونیة): بریتییە لە کەسایەتی مەعنەوی دەوڵەت کە جیای دەکاتەوە لە کەسایەتی یاسایی کەسە سروشتییەکان کە بۆ مرۆڤەکان چەسپیوە، بەجۆرێك ئەو کەسایەتییە بتوانێت مافەکان دەست بخاتو ئەرکەکان جێبەجێ بکات، واتە: بتوانێت خۆی پابەند بکاتو پابەندبوونیش فەرز بکات بەسەر خەڵکییەوە.

**ئەرکو وەزیفەی دەوڵەت:**

1. بەرگری دەرەکی: بریتیە لە پاراستنی سنوری دەوڵەتو پاراستنی قەوارەکەی لە هەر دەستدرێژیو هێرشێك دەکرێتە سەری، ئەمەش پێویست دەکات بە بوونی هێزێك بۆ ڕاپەڕاندنی ئەم ئەرکە.

2. ئاسایشی ناوخۆ: بریتیەلە پاراستنی سەروەت‌و گیانی هاووڵاتیان لەستەم‌و دەستدرێژی، ئەمەش پێویستی بە بوونی هێزێك هەیە بۆ جێبەجێکردنی ئەم ئەرکە.

3. جێبەجێکردنی دادگەری: بریتیە چەسپاندنی دادگەری لە نێوان هاووڵاتیانداو چارەسەری کێشەکانیان ئەمەش پێویستی بە بوونی دادگاو دەسەڵاتی دادگایی هەیە.

پاش دەستنیشانکردنی سیماو پایەو خەسڵەتەکانی دەوڵەت‌و دەسەڵاتی سیاسیی بە شێوەیەکی گشتی، ئەم بنەما زانستیانە دەچەسپێنین بەسەر مێژووی ئەو مومارەسانەی کە پێغەمبەر ﷺ ئەنجامی داون، ئەو جێنیشیانەش کە شوێنیان گرتەوە بۆ ئەوەی بۆمان دەرکەوێت ئایا ئەم بنەما زانستیانە لەگەڵ مومارەسەو دەسەڵاتی پێغەمبەر ﷺ یەکدەگرێتەوەو بەسەریاندا دەچەسپێت؟

پێغەمبەری خوا ﷺ پاش کۆچ کردنی بۆ شاری مەدەینە هەستا بە دامەزراندنی یەکەم دەوڵەت لەسەر بنەڕەتی بیروڕای ئیسلامی‌و هەموو ئەو پایەو خەسڵەتانەی بۆ دەوڵەتێکی نوێ پێویستە تێیدا بەدی دەکرێت لەگەڵ ڕەچاوکردنی ئەو گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتی‌و ئابووری‌و زانستی‌و ئیدارییەی کە هاتووە بەسەر ژیاندا کە ئەوەش بەڵگە نەویستە دەبێت بۆ هەموو هەڵسەنگاندنێکمان ئەو بارودۆخ‌و زروفانەش لێك بدرێتەوەو کاریگەرییان حسابی بۆ بکرێت. ئێستا ئێمە ئەو سیستەم‌و یاسایانەی سەدەی بیست کە بۆ دەوڵەت دەستنیشان کراوە بەسەر دەوڵەتەکەی پێغەمبەردا ﷺ دەچەسپێنین لەسەر بنەڕەتی ئەو دەستورەی کە پێغەمبەر ﷺ ڕایگەیاند پاش جێگیربوونی لە شاری مەدینە کە بە هاوڕایی‌و ڕەزامەندی‌و ڕێککەوتن لەگەڵ هەموو هۆزو عەشیرەت‌و خاوەن دینەکان بە موسڵمان‌و جوولەکەو بێباوەڕەکانەوە دەستورێکیان نووسی کە لە (47) مادده پێکهاتووە بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری سیاسی‌و سەربازی‌و کۆمەڵایەتی ئەو دەوڵەتە، لەو کاتەدا ئەم دەستورە بە (صحیفة) ناوبراوە، دەتوانین بنەماو خەسڵەتەکان‌و وەزیفەکانی دەوڵەت لە بڕگەکانی ئەو دەستورەوە دەستنیشان بکەین بەم شێوەیە:

. هەرێمی ئەو دەوڵەتەی پێغەمبەر بریتی بوو لە شاری مەدینەو دەوروبەری وەك لە بڕگەی (40)ی دەستوری مەدینەدا هاتووە (وان یثرب حرام جوفها لاهل هذه الصحیفة)، بە شێوەیەکی کرداریش پێغەمبەر ﷺ هاوەڵانی نارد بۆ ئەوەی ئالایەك هەڵبکەن لە سنوری هەرێمی مەدینە لە هەموو ڕوانگەکانییەوە.

. گەلەکەی بریتی بوون لە موسڵمانە کۆچەرییەکان‌و موسڵمانانی شاری مەدینەو جوولەکەو بێ باوەڕەکان کە خەڵکی مەدینە بوون یان لە مەدینەدا جێگیر بووبوون. وەك لە بڕگەی (25)ی دەستوری مەدینەدا هاتووە: (وان یهود بني عوف امة مع المؤمنین، للیَهود دینهم وللمسلمین دینهم موالیهم و انفسهم الا من ظلم نفسه واثم فانه لا یوتغ الا نفسه و اهل بیته). هەروەها لە بڕگەی (37)دا ئەرك‌و مافی هەریەکەیان دەستنیشان کراوەو لە دەستوری مەدینەدا گەل‌و هاووڵاتیانی ئەو دەوڵەتە بە وردتر باس کراوە، ئەویش بەناوهێنانی هەموو ئەو هۆزو عەشیرەتانەی کە ئامادەییان دەربڕیوە بۆ پابەندبوون بەو دەستورەوە وەك لە بڕگەکانی (25–34) ئاماژەیان پێکراوە.

. پایەی سێیەمی دەوڵەتی پێغەمبەر ﷺ بریتییە لە دەسەڵاتی سیاسیی، کە دەسەڵاتی ئیسلامی پیادە کراوەو پێغەمبەر ﷺ خۆی سەرکردەو حاکمی ئەو دەوڵەتە بووە، وەهیچ دەسەڵاتێکی تر نەبووە لەسەرو ئەو دەسەڵاتەوەو ئیرادەی خۆی فەرز کردووە بەسەر خەڵکی مەدینەدا هەروەك لە بەڵگەنامەی مەدینەدا لە برگەی (36)دا هاتووە: (وانه لایخرج منهم احد الا باذن محمد).

. سەبارەت بە خەسڵەتەکان دەوڵەتی پێغەمبەر ﷺ خاوەنی سەروەری تەواو بووە، وەك لە بڕگەی (43)دا هاتووە (وانه ماکان بین اهل هذه الصحیفة من حدث، او اشتجار یخاف فساده فان مرده الی الله و الی محمد وان الله علی اتقي ما في هذه الصحیفة وابره).

. سەبارەت بە کەسایەتی یاسایی ئەو دەوڵەتە، کەسایەتی مەعنەوی خۆی هەبووە کە جیای کردووەتەوە لە کەسایەتییە سروشتییەکان‌و ئەو خەڵکانەی لەناو شاری مەدینەدا ژیاون، ئەویش بەوەی کۆمەڵە ئەرکێکی بۆ خۆی دیاری کردووە کە

پێوەی پابەندبێت‌و لە هەمان کاتدا کۆمەڵە ئەرکێکیشی سەپاندووە بەسەر هاووڵاتیاندا هەروەك لە بڕگەکانی (12، 13، 14، 37، 39و 44)ی بەڵگەنامەی مەدینەدا دەردەکەویت.

. سەبارەت بە وەزیفەو ئەرکی حکومەت‌و دەوڵەت، دەوڵەتی پێغەمبەر خاوەنی هێزێکی بەرچاوو بەهێز بووە بۆ پاراستنی قەوارەی حکومەتی مەدینە، هەروەك لە جەنگی ئوحدو ئەحزابدا دەرکەوت، پاشان بەهەمان شێوە ئەو هێزە کاروباری ناوخۆیشی جێبەجیٚ کردووە، چونکە لەوکاتەدا ئەو جیاکردنەوەیە نەبووە کە هێزەکان پۆلێن بکرێن بۆ سوپا و پۆلیسی ناوخۆ، ئەو سیستمە بۆ وەزعێکی سەرەتایی پێویستی نەکردووەو کاری پیٚ نەکراوە، بەڵکو هێزی دەوڵەت ئامادەبووە بە بەردەوامی بۆ هەرکارێکی دەسەڵات‌و لە هەرکاتێکدا بووبێت.

. سەبارەت بە دادگەری: دەوڵەتی پێغەمبەر بە یەکسانی سەیری هاووڵاتیانی ئەو دەوڵەتەی کردووە لەگەڵ بوونی جیاوازی لە دین‌و بیروباوەر، هەستاوە بە دابەشکردنی ماف‌و ئەرکەکان بە یەکسانی ئەوەش لە بەڵگەنامەی دەستوری مەدینەدا هاتووە لە بڕگەی (15)دا: (وان ذمة الله واحدة)، بڕگەی (24) (وان اليَهود ينفقون مع المؤمنين ماداموا موحاربين).

بەم شێوەیە دەبینین هەموو مواسەفات‌و خەسڵەت‌و پایەکانی دەوڵەت کە ئێستا لە یاسای دەستوریدا ئاماژەی پێکراوە لەو قەوارەیەی پێغەمبەردا ﷺ هەبووە بەکرداریش کاری پێکراوە، پێغەمبەر ﷺ سەرۆکی دەوڵەت بوو، سەرکردایەتی سوپاکانی دەکرد، پێشنوێژی بۆ گەلەکەی دەکرد، دادوەر بوو بۆ کێشەکانی خەڵك، سەفیرو نوێنەری دەنارد بۆ لای دەسەڵاتەکانی تر، زەکات‌و پارەی کۆدەکردەوە و دەیبەخشیەوە بەسەرخەڵکدا،بەم شێوەیە دەبینین کاروباری پێغەمبەر ﷺ هەردوو بەرژەوەندییە دینی دونیاییەکانی خەڵکی بە ئەنجام دەگەیاند، کەواتە: دەتوانین بە دڵنیاییەوە ئەو قەوارەیە بەدەوڵەت‌و دەسەڵاتی سیاسی‌و حکومەت ناو ببەین، بەڵام لەو سەردەمەدا ژیان‌و بارودۆخی خەڵك سادەیی‌و ساکاری پێوەدیار بووە لە هەموو بوارەکاندا، ئەو ساکاری‌و سادەییەش بەشێواز‌و سیستەمی سیاسی ئەوکاتەوە دیارەو نابێت بەراوردی بکەین لەگەڵ ئێستادا، کە لە ڕووی پێشکەوتنی ژیان‌و گەشەکردنی بواری سیاسی‌و کۆمەڵایەتی‌و ئابوری‌و ئیداری‌و ئاستی ژیری مرۆڤەکان جیاوازی زۆر هەیەو ناکرێت هەردوو بارودۆخ بەیەکەوە هەڵسەنگێنرێن، بۆنموونە لەو کاتەدا وشەی دەستوور بەکارنەهێنراوە، بە تایبەت لەو ناوچانەدا ئەو یاسایەی لەسەری ڕۆشتون ناوبراوە بە (صحيفة) یان ئەو قەوارەیە لەو کاتانەدا ناو نەبراوە بە حکومەت، چونکە لەوکاتەدا پێناسەیەك بۆ حکومەت دانەنراوە، وسنوری جوگرافی‌و ڕێژەی دانیشتوانی هەر دەسەڵات وحکومەتێکیش دەستنیشان نەکراوە، تا جیاوازی بکات لە نێوان دەوڵەت‌و حکومەت‌و دەسەڵاتی خێڵەکی‌و عەشایری، بەڵام ئێستا دەبینین شارێکی وەك فاتیکان‌و قەتەر بە دەوڵەت ناودەبریت، یان لە کۆندا حامورابی کاتێك دەسەڵاتی بۆ دەگوێزرێتەوە لە باوکییەوە، بووەتە پاشاو حاکمی دەوڵەتی بابلی لە ساڵی 1792ی پێش زایین سنوری جوگرافی دەوڵەتەکەی (128)کم درێژیەکەی بووەو (40)کم پانییەکەی بووە، کە گەورەترین‌و ناودارترین دەوڵەت‌و دەسەڵاتی ئەو سەردەمە بووە.

هەروەها لەو کاتەدا ئەو بنەمایە دانەنراوە کەبوونی دەوڵەت‌و کەسایەتیە یاساییەکەی پەیوەست بێت بەڕێژەی دانیشتوان‌و سنوری جوگرافی، یان سنووری جوگرافیی‌و ڕێژەی دانیشتوان کاریگەری یاسایی نییە لەسەر بوون‌و قەوارەی دەوڵەت، ئەمەش وادەکات کە شانشینی بەحرەین‌و کوەیت دەوڵەت بن، وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاش دەوڵەت بێت، ئەم بنەمایانەی ئێستا لە یاسای دەستووریدا هاتووەو کراوەتە بنەمایەك بۆ دەستنیشانکردنی قەوارەی سیاسی دەسەڵات دوو پاتیدەکاتەوەو هیچ گومان‌و ڕاڕاییەك نایەڵێت کە هەموو بنەماکانی دەوڵەت‌و قەوارەی سیاسی‌و دەسەڵات بەسەردەوڵەتی پیغەمبەردا دەچەسپێت.

لە ڕابردوودا پەیکەری حکومەت وەك ئێستا نەبووەو ئەم سیستمەی ئێستا کاری پیٚ نەکراوە، وەك بوونی سەرۆك وەزیران‌و پەرلەمان یان دەستەڵاتەکانی تەشریعی‌و جێبەجێکردن‌و دادوەری جیابکرێتەوە، بەڵام گەر سەرنج بدەین بەپێی وەزعی ئەوکاتە هەموو پێداویستییەکانی دەوڵەت‌و میکانیزمەکانی ڕاپەڕاندنی کاری میللەتی تێدا بووە.

پاش ئەوەی یاساکانی دەستوری ئێستامان چەسپاند بەسەر دەوڵەتی پێغەمبەردا ﷺ هەموو بنەماو خەسڵەتەکانی تێدا بوو، ئێستا دێینە سەر دەوڵەتی ئیسلامی لە پاش کۆچی دوایی پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر بێت ).

پاش قۆناغی دامەزراندن سیستەمی سیاسی ئیسلامیی گەشەی کردو گۆڕانکاری هات بەسەردا هاوکات لەگەڵ گۆڕانکاری ژیاندا،کە پێشکەوتن لە هەموو بوارەکاندا هاتە دی، شانبەشانی ئەوەش شێوازی دەوڵەتو بەڕێوەبردن و کاروباری حکومەتو ئیدارە لە دەوڵەتی ئیسلامیشدا گۆڕانکاری بەخۆیەوە بینی، وەپاش پێغەمبەر ﷺ ئەم دەوڵەتانە حوکمیان کردووە :

. دەوڵەتی خولەفای ڕاشدین.

. دەوڵەتی ئومەوی.

. دەوڵەتی عەباسی.

. دەوڵەتی عوسمانی.

ڕێژەی ئەو ساڵانەی ئەم دەوڵەتانە کاروباری حکومەتیان بەڕێوە بردووە نزیکەی سیانزە سەدەو نیو بووە، جگە لەم دەوڵەتانەش لە هەندێك شوێنی دی دەوڵەتی بچووكو ئیمارات دروستبوونو کاریان بە پەیڕەوو بەرنامەی ئیسلام کردووە، وەك دەوڵەتی ئومەوی لە ئەندەلوس، دەوڵەتی مورابتین لە مەغریب، دەوڵەتی ئەییوبی لە میسرو شام، و..هتد.

گەر گوزەرێکی خێرا بکەین بە ڕووداوەکانی ئەو دەوڵەتانەدا سەرنج دەدرێت ڕۆژ لەدوای ڕۆژ گەشەکردنو پێشکەوتن هاتووە بەسەر سیستەمو کاروباری ئەم دەوڵەتانەدا، هاوتا لەگەڵ گۆڕانکارییەکانی ژیاندا بۆنموونە لە سەردەمی ئەبوبەکری صدیق و یەکەم جێنشین لە پاش پێغەمبەر ﷺ دەسەڵاتی دادوەری جیا کرایەوەو عومەری کوڕی خەتاب کرایە دادوەر، لە سەردەمی عومەری کوڕی خەتابدا سەربازگە دروستکراو سوپا جیاکرایەوە لە خەڵکی مەدەنی، پێکهێنانی دیوانەکان هێنرایە کایەوە، وەك دیوانی بیت المالو دیوانی سەربازیو دیوانی ناونوسکردن، ئەم یاسایەش لە بری وەزارەتەکانی ئەمڕۆیەو هەر دیوانێك کاروباری توێژێکی دەکرد کە لە بری وەزارەتەکانی داراییو بەرگرییو پلانی ئەمڕۆ دادەنریت، لە کۆتایی سەردەمی خولەفای ڕاشدیندا کە سنوری جوگرافی دەوڵەتی ئیسلامی فراوان بوو، بۆ هەر ویلایەتێك سێ بەرپرس دادەنرا یەکێك بەناوی والی کە بۆ کاروباری سیاسیو ئیداری ئەو ویلایەتە بوو، کەسێکیش بە ناوی بەرپرس لە کۆکردنەوەی خەراجو زەکات، کەسێکیش دادوەر بۆکاروباری دادوەری، پۆلیسی ناو شارەکان لە سەردەمی ئومەوییەکاندا هاتەکایەوە بۆ بەدەمەوەچوونی کێشەو ئاڵۆزییەکانی نێو خەڵك لەشارەکاندا، لەسەردەمی عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان سکەی پارە لێدرا، لە سەردەمی عەباسیدا سیستەمی وەزیر هاتە کایەوەو کاری پێدەکرا، لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانیدا ئەنجومەنی نوێنەران دروستکراوەو دەستور نووسرایەوە کە ئێستاش ئەو دەستورە بووەتە سەرچاوەیەکی گرنگی یاساکان لە زۆربەی دەوڵەتەکانی جیهاندا کە بەناوی (مجلة الاحکام العدلیَة) ناو دەبرێت، لێرەدا هەموو گۆڕانکاری و میکانیزمە ئیدارییو سیاسییەکانی دەوڵەتە ئیسلامییەکان باس ناکەین، بەڵام ئەوە پێویستە بزانرێت کە پەیکەری ئیداری حکومەتو دەسەڵاتە سیاسیەکان لەگەڵ گۆڕانکاری ژیانو پێداویستییەکانی ئەو سەردەمەو گەشەکردنی عەقڵیەتی مرۆڤایەتی گەشەیکردووە، بۆنموونە لە کاتی خۆیدا ئەو جیاکارییە نەبووە کە دەوڵەت دەبێت بە چەند جۆرێکەوە (دەوڵەتی ساکار، دەوڵەتی ئاڵۆز، دەوڵەتی یەکگرتووی مەرکەزی – دەوڵەتی فیدراڵی)، گەر سەرنج بدەین لە سەرەتادا دەوڵەتی ئیسلامی کە پێغەمبەر ﷺ سەرۆکایەتی کردووە لەسەر سیستەمی مەرکەزی ڕۆشتوەو دەوڵەتێکی یەکگرتوی ساکار بووە، بەڵام کە سنوری جوگرافی دەوڵەت فراونبووەو چەندین نەتەوەی جیاواز هاتنە ناو دەوڵەتی ئیسلامی لە سەردەمی عومەری کوڕی خەتابدا سیستەمی لامەرکەزی ئیداری بەکارهاتووە، بەڵام کە دەسەڵاتی دەوڵەتی ئیسلامی زیاتر فراوان بوو چەندین هەرێمو وڵاتی تر ڕزگار کراوەو بوونە بەشێك لە دەوڵەتی ئیسلامی، سیستەمی بەڕێوەبردن بوویە سیستەمی ویلایەت وەك لە سەردەمەکانی دەوڵەتی ئومەوییو عەباسی کە زۆر نزیکە لە سیستەمی فیدراڵی ئێستا، ئەم وردکردنەوەیە بە ڕاستی بۆ دەرخستنی ئەو هەڵە زەقو بێ بنەمایانە کە هەندێك ئاڕاستەی دەکەن

بەرانبەر بە ئیسلامو پەیامە پیرۆزەکەی کە گوایە ئیسلام هیچ پەیوەست نییە بە سیاسەتەوە!! ئیسلام سیاسەتی تێکەڵکراوە!! ئیسلام بە سیاسی دەکرێت!، چونکە ئەوەی ئەم جۆرە تێڕوانینانە بلاودەکاتەوە دەیەوێت گەورەترین بەڵگەنەویست لە مێژوو عەقڵی هاوولاتیاندا بشێوێنێت!! گەر ئاراستەی دەسەلاتی سیاسی جیهانی ئێستاو دۆخی تێکئالاوی ئەمرۆ نەبێت پێویست ناکات بگەڕێن بە شوێن بەڵگەی ئەوەدا کە ئایا ئیسلام دەوڵەتی هەبووە؟! یان ئیسلام هیچ پەیوەندییەکی لەگەڵ سیاسەتدا هەیە؟! چونکە ئەو کەسەی کەمێك لە مێژوو شارەزا بێت چاك دەزانێت نەك ئیسلام خاوەن قەوارەو دەوڵەت بووە، بەڵکو یەکێك بووە لە گەورەترین هێزەکانی سەرزەوی‌ولەوکاتەدا دەوڵەتی ساسانیو دەوڵەتی ڕۆمانیو دەوڵەتە گچکەکانی تری دونیای کۆنترۆڵ کرد، دەوڵەتی ئیسلامی یەکەم هێزێك بووە لەسەر گۆی زەوی لە ڕووی هێزو دەسەلاتی سیاسیو فراوانی سنوری جوگرافی کە لە مەغریبی عەرەبییەوە بۆ ناوجەرگەی چینی ئەمڕۆی لەژێردەستدا بووە،و لە باکورەوە لە ناوجەرگەی ڕووسیاوە تا دەریای عەربیو تاباشوری ئەفەریقا تاکە دەسەلات بووەو کاروباری ئەم دەوڵەتە فراوانە ئیسلام سیستەمی بووەو موسڵمان بەڕێوەی بردووە کە ئێستا ئەو سنورە زیاتر لە (100) دەوڵەتی لیَ پێکهاتووە.

لەم تەوەرەیەدا گفتوگۆ لەسەر ئەو دیدو بۆچون و تێڕوانینانە دەکەین کە کراونەتە پاساو گوایە ئیسلام سیاسەتی تێدا نییە، یان ئیسلام سیاسەتی تێکەڵکراوە، یان ئەو بانگەشانەی هەن بۆ جیاکردنەوەی کاروباری سیاسی لە کاروباری ئاینی.

**یەکەم:**

هەندێك وادەبینن کە دەسەڵاتی ئیسلامیی یەك دەگرێتەوە لەگەڵ تیۆری دەسەڵاتی لاهوتیو تەفویزی خواییدا، ئەو دەسەڵاتەی کە بە ناوی خواوەندەوە حوکم دەکاتو گەلو هاووڵاتیان هیچ ڕۆڵێکیان نابێت لە بەڕێوەبردنو نەخشەو کاروباری ئەو دەوڵەتەدا، هەڵسوڕێنەرانی ئەو دەوڵەتە لەبەر ئەوەی بە ناوی خواوە قسەدەکەن، کەس بۆی نییە ململانێیا ن لەگەڵ بکات لەسەر دەسەڵاتو کەس ناتوانێت ڕەخنەیان لێ بگرێت یان لێپێچینەوەیان لەگەڵدا بکات.

ئەم تێڕوانینە لەگەڵ سەرەتاترین بیروڕاکانی ئیسلامدا یەکناگرێتەوەو پێچەوانەی بنەما جێگیرو هێڵە گشتییەکانی سیستەمی ئیسلامییە، چونکە هەر لە سەرەتای هاتنەکایەی ئیسلامەوە بیروڕای ئیسلامیی ڕەخنەی گرت لە سیستەمی تەفویزی خواییو حکومەتی لاهوتی، چونکە لەگەڵ بیروڕای موسڵماندا ناگونجێت، لەو کاتەشدا کۆمەڵە سیستەمێك هەبوون کە لەسەر بنەمای تەفویزی خواییو حوکمی لاهوتی بنیاتنرابوون، بەتایبەت ئەو دەوڵەتانەی لەسەر بنەمای ئاینی مەسیحی بوون وپێشتریش جوولەکە قەوارەی سیاسیی خۆیان هەبووە، وەك خوای گەورە دەفەرمویت: (اتَّخَذُواْ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَاباً مِّن دُونِ اللّهِ وَالْمَسِيحَ ابْنَ مَرْيَمَ وَمَا أُمِرُواْ إِلاَّ لِيَعْبُدُواْ إِلَـهاً وَاحِداً لاَّ إِلَـهَ إِلاَّ هُوَ سُبْحَانَهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ) (التوبة: 31)، واتە: (زاناو عابیدەکانی خۆیان کردووە بە پەروەردگاری خۆیان لە بری خوای تاكو تەنها، هەروەها مەسیحی کوڕی مەریەمیشیان کردوەتە خوا، لە کاتێکدا فەرمانیان پێ نەدراوە بەوە، بەڵکو فەرمانیان پێکراوە کە خوای تاكو تەنها بپەرستن)، دەسەڵاتی سیاسی ئیسلامی زۆر جیاوازە لەگەڵ تیۆری تەفویزی خواییداو هەرگیز یەك ناگرێتەوە لەگەڵ دەسەڵاتی لاهوتێدا بەم بەڵگانەی خوارەوە:.

یەکەم: لە سیستەمی دەسەڵاتی ئیسلامییدا حاکمو خەلیفەو دەسەڵاتدار موقەدەس نینو وەك مرۆڤێك سەیر دەکرێن، هەڵەو کەمو کورتیشیان هەیە، ناتەواویشیان لێ بەدی دەکرێت وەك پێغەمبەرمان دەفەرمویت: (كل بني ادم خطاء وخير الخطائين التوابون)، واتە: (هەموو مرۆڤێك هەڵە دەکات، چاکترین ئەوکەسانەی کەوتونەتە هەڵەوە ئەوانەن پەشیما ن دەبنەوەو بەردەوام نابن لەسەر هەڵەکانیان)، بەڵام لە تیۆری لاهوتیو تەفویزی خواییدا حاکمو دەسەڵاتداران بە پیرۆز سەیر دەکرێتو خۆیان خستوەتە شوێن خواو بە ناوی خواوە قسەیان کردووە، بۆ نموونە لە هیندو میسرو ڕۆمانی کۆندا دەسەڵاتداران خۆیان خستووەتە جێگەی خوا،یان بە ناوی خواوە گوتاریانداوە، ئەو واقعەش خوای تاكو تەنها لە مێژووی میسری کۆندا بۆمان باس دەکات کە فیرعەونی میسر ڕایگەیاندووە بە گەلەکەی (فَقَالَ أَنَا رَبُّكُمُ الأَعْلَى)، (النازعات: 24)، واتە: (وتی من پەروەردگاری هەرەگەورەتانم)، ئەمە بۆ ئەوەبووە کەس ڕەخنەی لی نەگرێتو هیچ لێپێچینەوەو بەدواداچوونێك نەبێت لەگەڵ حاکمو دەسەڵاتداران، یان خۆیان کردووەتە واسیتە لە نێوان خواو خەڵکیدا، وایان لە خەڵکی حالێ کردووە کە تەنها ئەوان لە قسەی خوا تێدەگەنو ئەوان قسەکانی خوا بەذن بە خەڵکی،و ئەمەش وایان لێ دەکات کە پلەیان لە خەڵکی تر جودا بێتو پلەو مەقامی تایبەتیان هەبێت لەلای خواوەند، لە سیاسەتی ئیسلامیدا هەموو مرۆڤەکان بەندەی خوان، تەنانەت لە قورئاندا ڕوون کراوەتەوە کە پێغەمبەر محمد ﷺ بەندەی خوایەو مرۆڤێکە وەك مرۆڤەکانی تر، (الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَنزَلَ عَلَى عَبْدِهِ الْكِتَابَ وَلَمْ يَجْعَل لَّهُ عِوَجَا)، (الكهف: 1)، واتە: (هەموو سوپاسو ستایش بۆ ئەو پەروەردگارەی کە ناردوویەتە خوارەوە قورئان بۆ سەر بەندەی خۆی کە موحەممەدە، هیچ جۆرە لارییەکی تێدا دانەناوە)، لە ڕێزو پلەدا جیاوازی نییە لە نێوان حاکمو خەڵکی تر، (إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُم) (الحجرات: 13)، واتە: (بەڕێزترینتان لەلای خوا ئەوکەسەیە کە خۆی دەپارێزێت)، مەبەست جیاوازی نەکردنە لەسەر بنەڕەتی ڕەنگو پلەو نەژادو دەسەڵات، وە سەرنج دەدەین هەموو پێغەمبەران لە قورئاندا بە (عبد) بەندە ناویان هاتووە وەك باس لە پێغەمبەر ئەیوب دەکات (وَاذْكُرْ عَبْدَنَا أَيُّوب) (ص: 41)، واتە: (ئەی محمد باسی بەندەی ئێمە ئەیوبیان بۆ بکە)، تا خوای گەورە

بیسەلمێنێت کە پێغەمبەرانیش بەندەی خوان، هەرگیز پێغەمبەران بانگەشەی ئەوەیان نەکردووە کە خەڵك بیانپەرستێت، بەڵکو بانگەشەی خواناسیو پابەند بوونیان کردووە بەو پەیامەی خوای تاكو تەنها ناردوویەتی، (وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رِسُولاً أَنِ اعْبُدُواْ اللّهَ وَاجْتَنِبُواْ الطَّاغُوت) (النحل: 36)، واتە: (سوێند بەخوا لەناو هەموو گەلو میللەتێکدا پێغەمبەرێکمان ناردووە بەوەی کە تەنها خوا بپەرستنو دوور بکەونەوە لە هەر پەرستراوێکی تر)، تەنانەت لە قورئاندا ڕەخنە ئاڕاستەی محمد پێغەمبەر ﷺ کراوە، ئەمەش بۆ ئەوەیە تا خەڵك فێربێت کە پێغەمبەران لەگەڵ ئەوەشدا کە مەعصومنو بە بڕیاری خواو هەڵبژاردنی خوای گەورە، گوناهو تاوان ناکەن بەڵام شایستەی پەرستن نینو تەنها زاتێك کە بپەرسترێت خوای بەدەسەڵاتە، پێغەمبەران ئەركو کاریان گەیاندنو ڕاڤەکردنو ڕوونکردنەوەی پەیامەکەی خوایە، مەبەستیش لەوەدا ئەوەیە گەر پێغەمبەرێك لەو پلەوپایە بەرزەدا  بە بەندە ناوببرێت وبە مرۆڤ سەیربکرێت نابێت بخرێتە پلەی خوایی، بێگومان خەڵکی تر هەرگیز شایستەی ئەو پلەوپایە نابێت کە پێغەمبەران هەیانە هەرچەندە تواناو زانیاریو دەسەڵاتیشی هەبێت، لە تیۆری ئیسلامیدا تەنها پێغەمبەر مەعصومەو هەموو کەسێك قسەو گوفتاری لیٚ وەردەگیرێتو ڕەت دەکرێتەوە تەنها پێغەمبەر نەبێت، کەواتە: لە بیروڕای ئیسلامدا دەسەڵاتدارو سەرۆکەکان تەقدیس ناکرێنو وەك بەندەو مرۆڤێك سەیردەکرێن، بۆ سەلماندنی ئەمەش کاتێك ئەبوبەکر بوو بە جێنشینی پێغەمبەر ﷺ، یەکەم وتاری ئەوەبوو وتی: "کراوم بە سەرۆكو گەورەتانو چاکترینیشتان نیم، گەر چاکەم ئەنجامدا هاوکاریو پشتگیریم بکەنو گەر خراپەو ناڕەوایم ئەنجامدا ڕێکم بکەنەوەو دەستم بگرن"، حاکم لە ئیسلامدا مرۆڤێکەو هەڵبژێراوە بۆ ڕاپەڕاندنی کارەکانی خەڵکی، گەر بە شێوەیەکی چاكو ڕێکوپێك هەڵنەستێت ئەوا لە قیامەتدا سزای لەسەر وەردەگرێت ، (وَلاَ تَحْسَبَنَّ اللّهَ غَافِلاً عَمَّا يَعْمَلُ الظَّالِمُونَ إِنَّمَا يُؤَخِّرُهُمْ لِيَوْمٍ تَشْخَصُ فِيهِ الأَبْصَار) (ابراهيم: 42)، واتە: (وا مەزانە خوا بیٚ ئاگایە لەوەی کە ستەمکاران دەیکەن، بێگومان خوا دوایان دەخات بۆ ڕۆژێك کە چاوەکان تێیدا ئەبلەق دەبنو نانوقێن لە ترسان)، چونکە لە ئیسلامدا بەرپرسیارێتی تەکلیفو کارکردنە نەك تەشریفو خۆخزمەتکردن بێت، بۆ هەموو هاووڵاتیانو کارمەندو فەرمانبەرێکی ئەو وڵاتە هەیە ڕەخنە بگرێت لە دەسەڵاتداران بە ئاشکراو بیٚ بەدوادا هاتنی تۆڵەو حەق لیٚ کردنەوە، ئەوەش بنەمایەکی گرنگی حاکمو دەسەڵاتدارانی ئیسلام بووە لە ڕابردوودا، وەك پێغەمبەری خوا ﷺ فەرموویەتی: (من راى منكم منكرا فليغيره بيده ومن لم يستطع فبلسانه ومن لم يستطع فبقلبه وذالك اضعف الايمان)، واتە: (هەریەك لە ئێوە گەر خراپە و ناڕەواییەکتان دی هەوڵی بۆبدەن بیگۆڕن بە دەست، گەر بۆی نەلوا بە زوبان، گەر بۆی نەلوا بە دڵ، ئەوەش نزمترین پلەی بڕواداریيە) کە ئەمەش پێچەوانەی سیستەمی تەفویزی خواییە کە بەهیچ جۆرێك بوار نییە بۆ هاووڵاتییان رەخنەو تیبینی خۆیان هەبێت سەبارەت بە کاروباری دەسەڵات وکاروباری وڵات.

دووەم: لە دەسەڵاتی ئیسلامیدا حاکمو خەلیفە لادەدرێت گەر یەکێك لە هۆکارەکانی لادان دروست بوو وەك: نەخۆشی، فاسق بوون، هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام، بەدیل گیرانی، بەڵام لە حوکمی لاهوتیدا لادانو لابردن نییەو حاکم خۆی حوکمی ڕەها دەکاتو کەس بۆی نییە دەست وەرداتە کاروباری دەسەڵات، چونکە لە پرۆژەی دەسەڵاتی ئیسلامیدا کەسێك نییە ناوی (خليفة الله) بێت، کە بۆ هیچ دەزگا و تاکێك نەبێت ئەو کەسە لابدات لە پلەی دەسەڵاتدا، وەك ئیبن خەلدون دەڵێت: ئەم بنەمایە لەلایەن یەکەم خەلیفەی پێغەمبەرەوە ئەبوبەکری صدیق (ڕەحمەتی خوای لیٚ بێت) ڕاگەیەنراو جێگیری کرد ، ئەویش بەوەی کە کاتێك بەیعەتی پێکرا قەدەغەی کرد لە گەلەکەی کە پێی بڵێن (خليفة الله)، بەڵکو وتی: (من جێنشینی خوا نیم، بەڵام جێنشینی پێغەمبەری خوام ﷺ)، ئەم بنەمایەش خاڵی جیاکەرەوەی نێوان پرۆسەی دەسەڵاتی ئیسلامی و تیۆری تەفویزی خواییە، چونکە سەرۆك یان خەلیفە  جێنشینی پێغەمبەر ﷺ بێت ئەرکی ئەوەندەیە کە پارێزگاری لە دینو گوزەرانی خەڵکی بکات، خزمەتگوزاری پێشکەش بکات، نەك بە ناوی خواوەو لە جێی خوا قسە بکاتو کەس بۆی نەبێت قسە لە قسەیدا بکاتو کەس نەتوانێت بیگۆڕێت، خوا کەس دیاری ناکات بۆ سەرۆکایەتی خەڵك، ئەوە کارێکە پەیوەستە بە میللەت خۆیەوە، لە پرۆسەی سیاسیی ئیسلامییدا دەستنیشانکردنی سەرۆكو خەلیفە بریتیە لە گرێبەستێکی وەکالەت کردن، واتە ئەو سەرۆكو فەرماندەیە دەبێتە وەکیلی خەڵکی بۆ جێبەجێکردنو پارێزگاری کردن لە

دین‌و ژینیان، نەك ببێتە خاوەنیان یان ببێتە خواو جێنشینی خوا، گرێبەستی وەکالەش گرێبەستێکی مەرجدارە بەو مەرجانەی کە دەستنیشان دەکرێت لە نێوان حاکم‌و گەلدا، دەبێت هەڵسووکەوت‌و مومارەسەی کاروباری دەسەڵات بەپێی ئەو مەرج‌و خواستانە بێت کە لە گرێبەستەکەدا هاتوون، چونکە گرێبەستی وەکالەت کردن بریتیە لە هەڵسووکەوت کردنی حاکم کە نوێنەرە بە مۆڵەتی وەکیلەلەکەی کە گەل‌و جەماوەرە، نەك خۆکردنە خاوەن‌و بڕیار بەدەستی ڕەهاو بێ کۆت‌و بێ سنور، هەروەها ئەم گرێبەستەش کاتییەو مەرجدارەو ملکەچە بۆ چاودێری گەل‌و میللەت، هەر کات گەل هەستی کرد نوێنەرەکەی دەیەوێت یان بە نیازە لە مەرجەکانی گرێبەستەکە لابدات یان سنور ببەزێنێت بۆی هەیە ئەو گرێبەستە هەڵوەشێنێتەوەو ئەو نوێنەرە بگۆڕێت‌و لایبدات، گەل‌و جەماوەر بۆی هەیە لێپرسینەوەوو لێکۆڵینەوە بکات لەگەل سەرۆك‌و دەسەڵاتدارێکدا لە کاتێکدا سنور دەشکێنێت‌و لە مەرج‌و بڕگەکانی ئەو گرێبەستە زیاتر یان کەمتر هەنگاوی نابێت، بۆئەم مەبەستەش شارەزایان‌و زانایانی ئیسلام کۆڕان لەسەر ئەوەی کە حاکم‌و سەرۆك وەکیلی گەل‌و نەتەوەیەو ملکەچە بۆ چاودێری ئەو گەلەو جەماوەرە، ئەویش دەسەڵاتی دانان‌و لادان‌و موحاسەبەکردن‌و لێکۆڵینەوەو ئامۆژگاری هەیە، ئەم دیدو بۆچوونەش سوودو بەرژەوەندی زۆرتری میللەتی تێدایە تا تیۆری گرێبەستی کۆمەڵایەتی کە زانایانی کۆمەڵناسی (جان جاك ڕۆسۆو هۆبز ولۆك) بانگەشەیان بۆکردووە، چونکە لە گرێبەستی کۆمەڵایەتێدا دەبێت، گەل لە هەندێك مافی خۆی وازبهێنێت‌و دەست بەرداری هەندێك لە ئازادییەکانی خۆی ببێت لە پێناو حاکم‌و فەرماندەدا تا بە ئەرکەکانی خۆی هەستێت، بەڵام لە ئیسلامدا گەل واز لە هیچ لە مافەکانی ناهێنێت‌و دەستبەرداری هیچ خواست‌و ئازادییەك نابێت، بەڵکو سەرۆکایەتی لە ئیسلامدا ئەرك‌و واجبێکە دەبێت جێبەجێ بکرێت نەك دەستکەوتێك بێت لە بەرانبەر ئەو ئەرکەدا هەندێك سوودو بەرژەوەندی ماددی یان مەعنەوی بەدەست بهێنێت، وە لە هەمان کاتدا گەل‌و جەماوەریش ڕێزو گوێڕایەڵی‌و پارێزگاری سەرۆك‌و خەلیفەکەی دەکات بە ئەرك‌و واجبیی خۆی دەزانێت نەك هەندێك مافی خۆی بێت‌و بە خشیبێتیە حاکم‌و سەرۆك.

سێیەم: لە حوکمی لاهوتیدا سەروەری تەنها بۆ حاکم‌و سەرۆکە، بەڵام لە ئیسلامدا سەروەری بۆ دینی خوایە نەك بۆ حاکم‌و خەلیفە، واتە لە حوکمی لاهوتیدا دەبێت بڕیارو قسەو ڕێنمایی سەرۆك جێبەجێ بکرێت‌و کەسیش بۆی نییە ڕەخنەو پێشنیارو ململانێ بکات، چونکە قسەی حاکم‌و دەسەڵاتدار لە سیستەمی لاهوتیدا قسەو گوفتاری خواوەندە، دەبێت هەمووی ملکەچ بێت، بەڵام لە دەسەڵاتی ئیسلامییدا سەروەری بۆ تاك‌و دەستەی دەسەڵات نییە، بەڵکو دەگەڕێتەوە بۆ ئەو دین‌و بەرنامەیە کە خوا ناردویەتی وەك لە قورئاندا ئاماژەی پێکردووە (إِنِ الْحُكْمُ إِلاَّ لِلّه) (الانعام: 57)، واتە: (فەرمانڕەوایی تەنها بۆ خوایە)، سەروەرییش کە دەوترێت تەنها بۆ شەریعەتە بۆ ئەوەیە ئەو دەوڵەتە ببێتە دەوڵەتێکی دەستووری و سەرچاوەیەك هەبێت هەموو لایەك بۆی بگەڕێتەوە لە کاتی ناکۆکیدا، ئەو سەرچاوەیە ببێتە بنەڕەت‌و بناغە بۆ هەموو دەسەڵاتەکان، چونکە دەبێت دەوڵەت سەرچاوەیەکی خۆی هەبێت کە کەس نەتوانێت پێشێلکاری تێدا بکات‌و هەمووی ملکەچی بێت بە حاکم‌و گەل‌و هاووڵاتیانەوە، بە تایبەت کە کیشەو ناکۆکییەك دروست دەبێت لە نێوان دەسەڵات‌و دەزگاکاندا، بەڵام لە دەسەڵاتەکانی تردا ئەو سەروەرییە دەگەڕێتەوە بۆ تاکێك یان دەستەیەك، بۆ نموونە لە دەستوری شانشینی ئۆردونیدا لە ماددەی (30)دا هاتووە (پادشا سەرۆکی دەوڵەتەو پارێزراوە لە هەموو بەرپرسیاریەتێك‌و بەدواداچوونێك)، یان لە دەستووری مەغریبیدا لە ماددەی (23)دا هاتووە کە (کەسایەتی پادشا موقەدەس‌و پلەوپایەو ڕێزی لەکەدار ناکرێت بە هیچ شێوەیەك)، لە دەستووری فەرەنسی ساڵی 1957دا هاتووە: "کە سەرۆك کۆمار نابێت لێ پێچینەوەی لەگەڵدا بکرێت بۆ هەرکارێك کە ئەنجامی دەدات تەنها لە کاتی (الخيانة العظمى)دا نەبێت"، لێرەدا سەرنج دەدەین کە لە سیستەمەکانی تردا ئەو پیرۆزی‌و تەقدیسە دراوەتە کەسێك یان دەستەیەك، بوار نادرێت لێپێچینەوەی لەگەڵدا بکرێت، یاسای بەسەردا ناچەسپێت، بەڵام لە ئیسلامدا هەموو کەسێك بە فەرمانڕەواشەوە بەرپرسیارەو یاسای بەسەردا دەچەسپێت‌و ڕەخنەشی لێ دەگیرێت، سەروەری بۆ ئیسلام مەبەست ئەوەنییە کە ڕەخنە لە ئیجتیهادو بیرو ڕاو فەتوای زانایانی ئیسلامی نەگیرێت، بەڵکو ڕەخنەگرتن‌و قسەکردن لە کاری دەسەڵاتداراندا ئاسایی

بووه، بەڵگە لەسەر ئەو ڕاستییە عومەری کوری خەتتاب ڕەحمەتی خوای لێ بێت، وتوویەتی: (رحم الله من أهدى اليَنا عيوبنا) واتە: (بەر بەخشندەیی خوا بکەوێت هەرکەس ناتەواوی‌و هەڵەی ئێمە دەزانێت‌و نیشانمان دەدات)، تەنانەت ڕاگەیاندن‌و ئاگادارکردنەوەی هەڵەو ڕەخنەو کەمو کورتییەکان بە دیاری بۆ بردن ئاماژەی پێکردووە کە ئەمەش هاندانێکە بۆ تاکەکان کە سڵ نەکەنەوە لە دەربڕین‌و دەستنیشانکردنی هەڵەکان، پاشان دووپاتی کردووەتەوە ئەو کەسەی بەو ئەرکە هەڵدەستێت دوعای بۆ دەکات، هیوا دەخوازێت و داوا دەکات کە بەر ڕەحمەتی خوا بکەوێت، لەڕووی کرداریشەوە ڕەخنە نەگرتن لە ئیسلامدا سنوری زۆر تەسکە کە تەنها ئەو دەقانە دەگرێتەوە کە قەتعین‌و زۆرتر لە بواری عەقیدەو ئیمان‌و دروشمەکانی خواناسیدان، کە ئەوانیش کۆمەڵە دەقێکی سنوردارو دیارییە لە قورئان‌و فەرمودەدا دەستنیشان کراون کە ئەمانە دەق‌و بەڵگەی براوەن،و دەبێت هەموو مرۆڤەکان پێوەی پابەند بن‌و لە بواری ئیجتیهادو لێکۆڵینەوە دەردەچن، ئەم دەقانەش لە مەسەلەی دەسەلاتی سیاسیدا زۆر کەمە، لەو سنورە بترازێت خەڵك بەگشتی "فەرمانڕەواو هاوولاتیان" ئەوانەی لە دەسەلاتن‌و ئەوانەی ئۆپۆزیسیۆنن بۆیان هەیە ڕای خۆیان بڵێن‌و ڕەخنەش بگرن‌و ڕای هەمە چەشنە هەبێت، جیاواز لەوەی کە دەسەلات دەیڵێت یان بڕیاری لەسەر دەدات. نموونە لەسەر ڕەخنەگرتنیش لە حاکم‌و دەسەلاتداران لە کاتێکدا عومەری کوڕی خەتاب خەلیفەی دووەمی پێغەمبەر ﷺ بوو، فەتوایدا لە یاسایەکی باری کە سێتیدا سەبارەت بە دەستنیشانکردن‌و سنوردانانێك بۆ مارەیی ئافرەت، بەلام ئافرەتێك هەستایەوەو ڕەخنەی لە فتواو بڕیارەکەی عومەری کوڕی خەتاب گرت‌و ڕایگەیاند کە ئەو فەتوایەی خەلیفە پێچەوانەی دەقێکی قورئانە، عومەری کوری خەتاب کە هەستی کرد هەڵەی کردووە زۆر ڕاشکاوانە ڕایگەیاند کە عومەر هەڵەی کردووەو ئەو ئافرەتە ڕاستی کردووەو فتواکەی ئەو دروست‌و تەواوە، وە زۆربوونی قوتابخانە فیکری‌و فیقهییەکان لەم ڕوانگەیەوە سەرچاوەی گرتووە لەبەر ئەوەی کە زۆرێك لە دەقەکانی قورئان (ظني)ن و بواری ئیجتیهادو ڕای جیاجیای تێدایە. مەبەست لەسەروەری بۆ شەریعەت ئەوە نییە کە خەڵك بۆی نەبێت قسە لەقسەو فەتوای زانایانی ئیسلامی‌و فوقەهاکانی بکات، هەرچۆن لە دینی مە سیحی وجوولەکەکاندا هەیە، کەس بۆی نییە  قسە لە گوتارو فەتوای پاپاو قە شەو کاهینەکان بکات، مەبەست لە سەروەی لە ئیسلامدا بۆ دەقەکانی قورئان‌و سوننەتە نەك ئەو کەسانەی هەڵدەستن بە راڤەو شیکردنەوەی دەقەکان .

چوارەم: لە حوکمی لاهوتیدا دەسەلاتی ڕەها بۆ حاکمەو تەنها خۆی بڕیاربەدەست‌و خۆی سەرچاوەی بڕیارو دەسەلاتەکانە، بەلام لە ئیسلامدا سەرچاوەی دەسەلات گەلەو سەرۆك دەبێت بۆ کاروبارەکانی دەوڵەت بگەرێتەوە بۆ لای گەل‌و هاوولاتیان، ئەو بنەمایانەش کە ئەمە دەسەلمێنن ئەوەیە کە سەرۆك‌و دەسەلاتدار لە سیستەمی ئیسلامیدا دەبێت بە هەڵبژاردن بێت‌و خەڵك ڕەزامەندی دەربڕێت لە سەرئەوەی کە ئەو سەرۆکە فەرمانڕەوایەتییان بکات، "جگە لەوەش دەبێت دەسەلاتدار ئەنجومەنی ڕاوێژی هەبێت‌و نابێت بە تاکڕەوانە حوکم بەڕێوە بەرێت ، ئەو ئەنجومەنەش دەبێت بە هەڵبژاردن دەستنیشان بکرێن‌و لە لایەن جەماوەرەوە هەڵدەبژێردرێت"، بەڵگەشمان لەسەر ئەوە پێغەمبەر بۆ نوێنەرایەتی خەڵکی مەدینە لە بەیعەی عەقەبەی دووەمدا فەرمووی دوانزە نەقیبم لە نێوان خۆتاندا بۆ هەڵبژێرن، لە پاشاندا ئەو دوانزە کەسە بوونە نوێنەرانی ئەنصارو لە کاروبارەگشتیەکاندا پرس‌و ڕا دەکرا بە و دوانزە نوێنەرە کە خۆیان هەڵیان بژاردبوو، بەلام هەندێك جارو بۆ هەندێك کاروبار پێویستی بە ڕیفراندۆمی گشتی هەبوو کە دەبوایە پرس بکرێت بەجەماوەر، نموونەش لەسەر ئەمە هەڵبژاردنی (عوسمانی کوڕی عەفان)ە کە کاتێك عومەری کوری خەتتاب هەولی تیرۆر کردنی درا پێش شەهیدبوونی شەش کەسی دەستنیشان کرد (عوسمانی کوری عەففان، عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف، عەلی کوری ئەبو تالیب، سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص، زوبێری کوڕی عەوام، تەلحەی کوڕی عوبێدوڵلا)وە پێی ڕاگەیاندن کە بە پرس‌و ڕاوێژ لەناو خۆیانداو لەناو خەڵکیدا یەکێك هەڵبژێرن لەو شەش کەسە بۆ جێنشینی عومەری کوڕی خەتتاب، پاش ئەوەی لەناو خۆیاندا پرس‌و ڕایان کرد دوو کەس دەستنیشان کران (عوسمانی کوری عەففان)، (عەلی کوڕی ئەبو تالیب)، وەك پاڵێوراو بۆ ئەو پۆستە. پاشان عەبدوڕڕەحمانی کوڕی عەوف هەستا سێ شەوو سێ ڕۆژ پرس‌و ڕای بە خەڵك کرد، کە ئایا

عوسمانی کوڕی عەففان شیاوترە بۆ خەلیفایەتی یان عەلی کوڕی ئەبو تالیبو لە پرسو ڕاکەیشیدا ئافرەتانی بەشدار کردووە.

دیاردەیەکی تر کە دەیسەلمێنێت دەسەڵاتی ئیسلامی دەبێت بگەڕێتەوە بۆ گەلو جەماوەر، ئەوەیە کە لە هەرکاتێکدا دەسەڵاتدار لە کاروباری خۆیدا کەمتەرخەمی کرد یان دەسەڵاتو بڕیاری لە خۆیدا یان بنەماڵەیەکدا سنوردار کرد، گەل بۆیان هەیە لە ڕێگەی ئامۆژگاریو ڕێنماییەوە هەوڵی چاکسازی بدەن (وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَى الْخَيْرِ وَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ) (ال عمران: 104)، واتە: (با لە نێو ئێوەدا کۆمەڵێك ببێت بانگەواز بکەن بۆ چاکەخوازی وفەرمان بدەن بە هەموو چاکەیەك و ڕێگری بکەن لە هەموو خراپە یەك)، گەر بە ئامۆژگاریو گفتوگۆ چاك نەکرا ئەوا بە کردار دەبێت هەوڵی لادانی بدەن، (من رِاي منكم منكرا فليَغيره بيده و ان لم يستطع فبلسانه و ان لم يستطع فبقلبه و ذالك أضعف الايمان)، کە ئەویش بەو ڕێگایانەی کە گونجاوەو لە توانای گەلدا هەبێت وەك خۆپێشاندانو مانگرتنو لادان بەپێی دەستوور، هەروەها گەل دەتوانێت ئەو سەرۆكو فەرمانڕەوایە لابداتو بیگۆڕێت گەر پێویستی بە شۆڕشیش کرد، بە مەرجێك زیانو خەسارەتی شۆڕشەکە کەمتر بێت لە ستەمو زیانەکانی فەرمانڕەواکان، لە ئیسلامدا دەسەڵات تاپۆ ناکرێت بۆ بنەماڵەو دەستەو تاقمێك، وە بۆ سەلماندنی ئەمەش زۆرێك لە شۆڕشەکان کە لە مێژوودا ئەنجامدراون بۆ گەڕانەوەی شەرعییەتی دەسەڵات بووە بۆ گەل، هەوڵدان بووە بۆ لادانی ئەو دەسەڵاتدارانەی کە دەستیان داوەتە ستەمو خراپەکاری لەگەڵ گەلو نەتەوەکانیانو لەسەر بنەمای سیستەمی ئیسلامی فەرمانڕەوایەتیان نەکردووە، وەك شۆڕشی حوسەینی کوڕی عەلی دژی دەسەڵاتی یەزەیدی کوڕی مەعاویە، شۆڕشی عبدالله ی کوری ئەشعەس دژی دەسەڵاتی حەجاجی کوڕی یوسفی سەقەفی، شۆڕشی عەبدوڵڵای کوڕی زوبێر دژی دەسەڵاتی عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان، بێگومان لەم شۆڕشانەشدا سەدان کەس بوونەتە قوربانیو خوێنیان ڕشتووە لە پێناو گەڕانەوەی شەرعییەتی دەسەڵات بەو شێوەی سیستەمی ئیسلامی داوای دەکات کە بریتییە لە گەڕانەوەی دەسەڵات بۆ گەل.

پێنجەم: لە حوکمی لاهوتیدا هیچ چاودێریو بە دواداچوونێك نییە بەرانبەر بە کارەکانی حاکمو سەرۆك بەڵام لە دەسەڵاتی ئیسلامیدا حاکم چاودێری دەکرێت لە چەند بوارێكو لە چەند لایەنێکەوە وەك:

. چاودێریکردنی لە لایەن پەروەرگارەوەو هەستکردن بەو چاودێرییەو قەناعەت بوون بەوەی لێپرسینەوەو بەدواداچوون هەیە لە ڕۆژی قیامەتدا ئەمەش وادەکات لە فەرمانڕەوا کە هەست بکات چاودێری کراوە بە هەمیشەییو لە هەموو شوێنێکدا. گەر کەسیان لەگەڵ بێت یان بەتەنها بن وەك لە قورئانداهاتووە (إِنَّ اللّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيباً) (النساء: 1)، واتە: (بە ڕاستی خوا هەمیشە چاودێر بووە بەسەرتانەوە).

– چاودێریکردنی لە لایەن دەسەڵاتی تەشریعییەوە کە بۆیان هەیە سەرۆك موحاسەبە بکەنو لایبدەن گەرکارو ئەرکەکانی بە شێوەیەکی تەواو نەکرد.

–چاودێری لە لایەن دەستەی فەرماندان بە چاکەو ڕێگرتن لە خراپە، کە یەکێکە لە دەزگا گرنگو چاودێرییەکانی دەسەڵاتی ئیسلامیو کارەکانی بریتییە لە چاودێری سەرۆكو دەسەڵاتە جیا جیاکان لە سیستەمی دەسەڵاتی ئیسلامیدا، زۆرجار ئەم دەزگایە بە هەڵەو ناتەواوی خراوەتەڕوو کە گوایە کاریان تەنها بۆ فەرماندان بە چاکەو ڕێگرتن لە خراپەی هەژارو هاووڵاتیانە، یان ئەوانەی کە پلەو پایەیان نییە لە کۆمەڵگادا، یان وەك دەزگایەکی سیخوڕی بەسەر خەڵکییەوە خراوەتە ڕوو، بەڵام ئەم دیدو بۆچوونانە هەڵبەستراوە و ڕاستییەکان شێوێنراوە، چونکە ئەم دەزگایە دەزگای چاودێرییە بەسەر دەسەڵاتدارانو دەزگاکانی حکومەتو پاشان بەسەر هاووڵاتیان وخەڵکی بە شێوەیەکی گشتی.

– چاودێری گشتیو ڕەها کە ئەویش بۆ هەموو هاووڵاتییەکی سادەو بێ پلەو پایە دەرگا والایە کە ڕەخنەو پێشنیارو گلەیی خۆی بگەیەنێتە سەرۆك، بەڵام بە میکانیزمو شێوازێکی یاسایی، وە عومەری کوڕی خەتاب ئەم بنەماییەی کردە بنەمایەکی کاری سەرۆکایەتیو وتوویەتی: "ڕەحمەتی خوا لەو کەسەی کە هەڵەو ناتەواوییەکانم بە دیاری بۆ دێنێت)، وە نەبوونی چاودێریو بواردان بە ڕەخنە وایکردووە لە حوکمی لاهوتی کە ببێتە حوکمی تاكو دکتاتۆری، چونکە بوونی

چاودێری ڕاستو دروست ڕێگری دەکات لە دروستبوونی حوکمی دیکتاتۆریو تاکڕەوی، بۆ ئەومەبەستەش ئیسلام چەندین ڕێو شوێنی داناوە بۆ چاودێریکردنی دەسەڵات و سەرۆك و دەزگا جۆربەجۆرەکانی دەسەڵاتی سیاسی، واتە: دەسەڵاتی ئیسلامی هەر لەبنەڕەتدا لەسەر کۆمەڵێك دامو دەزگاو دامەزراوە پێکدێت (دولة المؤسسات)ە بێ گوێدانە ئەو کەسایەتییانەی دەوڵەت بەڕێوە دەبەن، چونکە سەرەتای تاکڕەویو دکتاتۆریەت لە دەوڵەتێکەوە دروست دەبێت کە زیاتر حساب بۆ کەسایەتییەکان بکرێت نەك دامەزراوەکان، یەکێك لە دامەزراوە گرنگەکانی دەسەڵاتی ئیسلامی بریتیە لە دامەزراوەی چاودێری کردنی کاری دەسەڵاتو حاکمو کاربەدەستان بە شێوەیەکی گشتی.

حەوتەم: لە حکومەتی لاهوتیدا دەستوور بوونی نییە، بەڵکو حاکم خۆی دەستوورو خۆی سەرچاوەی دەستوورە، چونکە خۆی یان بە خوا دەزانێت یان بە جێگری خوا خۆی ناساندووە، بەڵام لە دەسەڵاتی ئیسلامییدا دەستوور بە یەکێك لە سیماو دیاردە سەرەکییەکانی ئەو دەوڵەتە دادەنرێت، بوونی دەستور بە یەکێك لە ئەرکە گرنگەکانی حاکم دادەنرێت کە پێویستە ئەو دەسەڵاتەی کە هەیەتی سەرچاوەی گرتبێت لە دەستوورەوە، هەرچۆن پێغەمبەری خوا ﷺ لەگەڵ دامەزراندنی دەوڵەت لە شاری مەدینەو لەگەڵ دروستکردنی مزگەوت و پێکهێنانی برایەتی نێوان ئەنسارو کۆچەرییەکان، لە ئەنجامی پەیماننامە بەستن لە نێوان ئەو دەسەڵاتەو جوولەکەکانی شاری مەدینەو بێباوەڕەکانیدا هەستا بە نووسینەوەی دەستوورێك‌و هەڵواسینی لە شاری مەدینەدا، بۆ ئەوەی هەموولایەك ئەرك‌و ماف‌و سنوری دەسەڵاتەکان بزانێت، چونکە ئیسلام هاتووە بۆ ئەوەی دەوڵەتی یاساییو دەستووری دامەزرێنێت، هاتووە دەسەڵاتێك بنیاد بنێت لەسەر بناغەی دامودەزگاو دامەزراوەکان کار بکات نەك لەسەر تەقدیسکردنی تاك‌و پیرۆز ڕاگرتنی بنەماڵەو دەستەیەك، بەڵکو دەیەوێت کارەکان لەسەر بنەمای دامەزراوەیی (مؤسسات) بڕوات‌و تاك‌و دەستە دەستێوەردانیان نەبێت‌و مەزاج‌و بەرژەوەندیو ئیجتهادی تاك کاریگەری لەسەر دروست نەکات، هەروەك دکتۆر منیر بەیاتی لە کتێبی (الدولة القانونية والنظام السياسي الاسلامي)دا دەڵێت: (لە کاتێکدا ئەوروپا لە سەدەکانی ناوەڕاستیدا دەژیان لە ژێر سایەی دەسەڵاتی تاك کە حاکم بە تەنها دەسەڵاتی ڕەهاو بێ سنورو بێ چاودێر بوو، مامەڵەی بە مرۆڤەکانەوە دەکرد هەرچۆن بیویستایە، مرۆڤەکان ئازادیو مافیان نەبوو لە لایەن دەوڵەتەوە، گەل لە بەرانبەر دەوڵەتەوە هیچ بوونێکی نەبوو، لەو کاتەدا بیرۆکەی مەشروعییەت‌و ملکەچبوونی دەوڵەت بۆ دەستوورو یاسا دانی پێدا نەدەنرا، دەسەڵاتی یاسایی خەونێك بوو لە خەونە ئەستەمەکان کە بێتە دی، لەوکاتەدا پێغەمبەر یەکەم دەوڵەتی یاساییو دەستوری دامەزراند لە شاری مەدینە،وە هەروەها لە پاش ئەویش لە لایەن خەلیفە ڕاشیدییەکانەوە ئەو دەسەڵاتە لەسەر بنەمای دەستوور بەردەوام بوو،وە ملکەچ بوو بۆ هەموو جۆرە چاودێرییەکان‌و ماف‌و ئازادییەکانی دەستنیشان کردبوو، دەسەڵاتی ڕەهای نەهێشتبوو بۆ هیچ کەس‌و دەزگایەك) هەندێك لە زانایانی دەستوریی بە هەڵە ئاماژە بە مێژووی یەکەم دەستوری نووسراو دەکەن، دەستوری ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا کە لە ساڵی 1787ز نووسراوەتەوە بە یەکەم دەستووری نووسراو دادەنێن، بەڵام لە ڕاستیدا یەکەم دەستووری نووسراو ئەوەیە مێژوونووسان دووپاتیان کردووەتەوە (شەریعەتی ئۆرنمۆ) بە یەکەم دەستوری نووسراوو کۆکراوە دادەنرێت کە تائێستا دۆزرابێتەوە کە لە لایەن پاشای شاری (اور) دانراوەو بە ناوی خۆیەوە ناوبانگی دەرکردووە، هەروەها دەستووری ئیسلامی کە لەلایەن پێغەمبەرەوە ﷺ داڕێژراوەو بە (صحيفة) ناوبراوە زیاتر لە چەند سەدەیەك پێش دەستووری ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا نووسراوەتەوەو بنەماکانی دەسەڵات‌و ئەرك‌و مافەکانی حاکم‌و هاووڵاتیانی لە خۆگرتووە، بەڵام زۆر جارو لە لایەن زۆرێك لە نووسەرانەوە بە هەڵە دەستوری ئەمەریکی ناو دەبرێت بە یەکەم دەستوری نووسراو، وەك لە سەرەتاوە ئاماژەشمان پێکرد کە قورئان یەکەم سەرچاوەی ئەو دەستوورەیە، پاشان سوننەتی پێغەمبەر ﷺ کە بە شێوەی کۆمەڵە بنەمایەکی گشتی بابەتەکانی دەسەڵات‌و حاکم‌و چۆنییەتی دیاریکردن‌و لادانیان، وسیستەمەکانی جەنگ‌و ئاشتیو سنوری دەسەڵاتی تەشریعیو تەنفیزیو دادوەری دەستنیشان دەکات، ئازادی تاك‌و هاووڵاتیان‌و ماف‌و ئەرکی هەریەکە لە حاکم‌و کۆمەڵگاو کەمینە ئایینیەکان دیاری دەکات، لە پاش ئەو دوو سەرچاوە یەش چەندین سەرچاوەی تری دەستور دانراوە لە لایەن زانایان‌و بیریارانی

ئیسلامییەوە کە هەندێکیان زانایان کۆڕان لە سەری، هەندێکی تریان ڕا جیایی لەسەرە بەڵام دەتوانرێت کاری پێبکرێتو سوودی لێوەربگیرێت وەك سەرچاوەیەکی پاشکۆیی بۆ دەوڵەمەندکردنی ئەو دەستورە، گرنگترین ئەو سەرچاوانەش بریتییە لە (ئیجماع، قیاس، عورف، ئیستحسان، وتەی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ، مەصلحەت، سەدی زەریعە، شەرعی پێش ئیسلام).

**دووەم:**

هەندێك کە قووڵ نەبوونەتەوە لە دەقاکانی ئیسلام دەڵێن:

سیاسەت تێکهەڵکێشکراوە لەگەڵ ئیسلامداو سیاسەت بنەمایەکی پتەوی لە دەقەکانی قورئان یان فەرموودەدا نییەو تەنها چەند دەقێك هەیە کە وەك پێشنیاز وایە لە بواری ئاکاری سیاسی، بنەماکانی دەسەڵاتی سیاسی بوونی نییە لە ئیسلامداو لە قورئاندا ڕێنمایی ژیانێکی سیاسی تێدا بەدی ناکریت!!.

وەك لە تەوەرەی سەرچاوەکاندا ئاماژەمان پیکردکە قورئان  سەرچاوەیەکی سەرەکی دەستورو پرۆگرامی ئیسلامە، بەڵام تەنها هێڵە گشتییەکان باس دەکاتو ناڕواتە نێو ووردەکارییەکانی کاری سیاسی وچۆنیەتی پیادەکردنی سیاسەت ، ئەمەش یەکێکە لە خەسڵەتە بنەڕەتییەکانی دەستوری هەموو وڵاتان کە کورتیو پوختەیی بووەتە سیمای سەرەکی دەستوورەکانی دوونیا، وەزۆرترینیان لە کۆمەڵە ماددەو بڕگەیەکی کەم پێکهاتوونو بۆ هەموو مەسەلەیەك تەنها بە دەقێك یان چەند دەقێك ئاماژە بەو بابەتە دەکەنو تەنها هێڵێ گشتیو چواچێوەیەك دیاری دەکات بۆ ئەوەی لەو دەقەوە دەسەڵاتی تەشریعی (قوانین دەربکات)و لەپاش ئەوانیش دەسەڵاتی تەنفیزی (انظمة و تعلیمات) دەربکات، واتە قورئان ئەو چوارچێوەیەیە کە سنورێکی دیاریکراوی هەیەو دەسەڵاتە جیاجیاکان لەو چوارچێوەیەدا دەتوانن تێیدا بجووڵێنو بەپێی داخوازیو پێداویستی ڕۆژانە بڕیاری نوێ دەربکەن، قورئان لەبەر ئەوەی پەیامە بۆ هەموو مرۆڤایەتیو بۆ گشت سەردەمو قۆناغێك تەنها سنورو چوارچێوەیەکی گشتی دیاری کردووە بۆ دەسەڵات، لەسۆنگەی ئەو چوارچیوەیەوە ئازادیو بواری داوە بە گەلان کە چۆن بەلایانەوە چاكو بەسوود بێت بۆ خۆیان، دەتوانن کاروباری دەوڵەت بەو شیوەیە ڕێکبخەن، ئیسلام خاوەن بەرنامەیەکی دیارو ڕۆشنە لە بواری دەسەڵاتی سیاسیدا کە لە چەند بنەمایەکی گشتگیردا دەستنیشان کراون، لەوانەش:

1. بوونی سەرۆك  دەبێت بە ڕەزامەندی گەل بێت:

دانانو بوونی سەرۆك واجیبە بە بەڵگەکانی قورئانو سوننەتو ئیجماعو فەتوای زانایان، خوای تاكو تەنها دەفەرموویت: (وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَآئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الأَرْضِ خَلِيفَةً) (البقرة: 30)، واتە: (بیریان بهێنەوە کاتێك پەروەردگارت بە فریشتەکانی وت بە ڕاستی من دەمەوێت جێنشینێك لە زەویدا دروست بکەم)، قورتوبی لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەڵێت: ئەم ئایەتە بنەڕەت و بنچینەیە بۆ دانانی پێشەواو خەلیفەیەك کە گوێی لێ بگیرێت ، بە هۆیەوە ئوممەت یەك بخرێتو ئەحکامەکانی تری خەلیفە جێبەجێ بکرێت، هیچ ناکۆکییەك نییە لەم مەسەلەیەدا لە نێوان ئوممەتی ئیسلامی و زانایانیدا، پێغەمبەر دەفەرموێت: (من مات ولیَس  فِي عنقه بیعة مات میتة جاهلیَة) موسلیم ڕیوایەتی کردووە، واتە: (ئەوەی بمرێتو لە گەردنیدا پەیمانی سەرکردەو پێشەوایەك نەبێت لەسەر بەشێك لە نەفامی مردووە)، ئەم فەرمودەیە زانایان کردوویانەتە بەڵگە لەسەر واجیب بوونی دەستنیشان کردنو هەڵبژاردنی سەرۆك، ئەویش بە بەڵگەی ئەوەی کە دەبێت هەموو کەسێك بەیعەتی پێشەوایەکی لە گەردندا بێت، بێگومان بەیعەتیش بەبێ سەرۆكو پێشەوا نابێت، ئیبن حەزمی زاهیری دەڵێت: (هەموو ئەهلی سونەو شیعەو خەوارجو مورجیئە لەوەدا ڕێکن کە پێویستە سەرۆك یان پێشەوایەك هەبێت)، ئیبن تەیمیە دەڵێت: (پێویستە بزانرێت کە دانانی سەرۆك بۆ خەڵك لە گرنگترین واجیباتەکانی دینە، بەڵکو دین بەرپا نابێت بەبێ بوونی سەرۆکێك)، ئەم بنەمایە بە شێوەیەکی ڕەها باسی کراوەو دیاریکراوە، بەڵام شێوازی هەڵبژاردنو میکانیزمو ئالیەتەکانی دەستنیشانکردنی ئەو سەرۆکەی بەجێهێشتووە بۆ خەڵك کە چۆنیان بۆ دەکرێت، چۆن ئاسانو گونجاوە بواری هێشتووەتەوە کە بیری لێبکرێتەوەو ئیجتیهادی تێدا بکرێت. ئەمەش یەکێکە لە سیفەتە گرنگەکانی

بنەمای دەسەڵاتی سیاسی ئیسلامی ،کە هەموو مەسەلەکانی بە یەکجاری وبڕاوەیی یەکلا نەکردوەتەوە و بواری عەقڵو بیرکردنەوە بۆ خەڵك نەهێڵێت، چونکە ئیسلام لەلایەن خواوە نەنێراوە بە کۆمەڵە دەقێکەوە کە لەلایەن مرۆڤەکانەوە جێبەجێ بکرێت و وەك ئامرازێك بجووڵێن، بەڵکو خوای گەورە دەیەوێت ئەم پەیامەی ببێتە رێنماییەك بۆ بیرکردنەوەو جووڵاندنی عەقڵو هەوڵدان بۆ ئەوەی چۆن بۆ مرۆڤەکان بەرژەوەندی تێدایەو سوودو قازانجی ژیانی مرۆڤی تێدابێت کاری بۆ بکەن و هەوڵی بۆبدەن، ئەم شێوازەش گونجاوترە بۆ ژیان و مرۆڤایەتی بە گشتی کە بارودۆخ رۆژ بە رۆژ دەگۆڕێت و پێشکەوتن بە خۆیەوە دەبێنێت، لەبەر ئەوە ئیسلام داوای کردووە کە دەبێت قەوارەی سیاسی ئیسلامی سەرۆکی هەبێت و ئەو سەرۆکە بە ڕەزامەندیی و ڕازیبوونی خەڵکە کە حوکمیان بکات، بەڵام چۆنییەتی دانان و هەڵبژاردن و چ سیستەمێکی هەڵبژاردن کاری پێدەکرێت ئەوە دەستنیشان نەکراوەو مرۆڤەکان ئازاد کراون لەو بوارەدا، بەڵام ئەوەی کە ڕوون و ئاشکرایە ڕای زانایان و بەڵگەکانی قورئان و سوننەتی لەسەرە، دەبێت لەدیاری کردنی سەرۆکدا خەڵکی ڕازی بن لەسەری و نابێت بە زۆر یان بەمیراتگری ئەو پلەو پایەیە ببەخشرێت بە کەس، وەك عومەری کوڕی خەتتاب دەڵێت: (من بایع امیرا من غیر مشورة من المسلمین فلا بیعة له ولابیعة للذی بایعه فالخلافة شوری) واتە: "هەرکەسێك پەیمان بداتە سەرکردەیەك بەبێ ڕەزامەندیی و پرس و ڕای موسڵمانان، ئەو پەیمانە وەرگیراو نییە نە بۆ ئەو کەسەی پەیمانیداوە نە بۆ ئەو کەسەش پەیمانی پێدراوە، خیلافەت لە ئیسلامدابە شورایە"، نموونەش لەسەر ئەمە کاتێك عومەری کوڕی عەبدولعەزیز بوو بە خەلیفە لە ڕێگەی سیستەمی میراتگرییەوە لە دەوڵەتی ئومەوی لە یەکەم نوێژی جومعەدا ڕایگەیاند (ئەی خەڵکینە من گیرۆدەی ئەم ئەرکە قورسە بووم بەبێ وەرگرتنی ڕای خۆم و بێ خواست و داخوازی کردنی، ئەم کارەش کراوە بێ پرس و ڕای و موسڵمانان بووە، من ئەو بەیعەتەی لە ئەستۆتاندایە ئازادم کردن،خۆتان سەرپشك بن و خۆتان کەسێك هەڵبژێرن و ئەم کارەم گەڕاندەوە بۆ بەردەست ئێوە) بەمشێوەیە عومەری کوڕی عەبدولعەزیز ڕایگەیاند کە سەرۆك لە ئیسلامدا موڵکی کەس نییەو بە میراتی ناگوێزرێتەوە، تەنها گەل بۆی هەیە بڕیار بدات و مافێکی ڕەهای جەماوەرە.وەچەندین بەڵگە هەن کە دەیسەلمێنێت ئەوانەی بانگەشەی نەبوونی سیاسەت و سیستەمی سیاسی لە ئیسلامدا دەکەن زۆر دوورن لە واقیعو تێڕوانینی ئیسلام، چونکە ئیسلام بەرنامەی هەیە بۆ ڕێکخستنی دەوڵەت و کۆمەلگە وتاك، هیچ ئاست ولایەنێکی نەبواردووە وسیستەمێکی گشتگیرە، بۆ نموونە ڕێنمایی و بەرنامەی دیاری کردووە بۆ سەفەرێکی کورتی سێ کەسی کە پێغەمبەر دەفەرموێت گەر بەشوێنێکدا ڕۆشتن و سێ کەس بوون با کەسێکتان ببێتە گەورەو ئەمیرتان، ئەمەش بۆ ئەوەیە کە مرۆڤ لە سەفەرێکی کورت و کاتێدا کە سنوورداره بەچەندە کەسیکەوە دەبێت بەرنامەی هەبێت و کاتەکانی ڕێك بخات و کارەکانی لەسەرنەخشەو ڕاگۆڕینەوە بێت و دووربکەونەوە لە ناکۆکی و دووبەرەکی، گەر ئیسلام بەو شێوەیەداکۆکی بکات لە سوودبینین لە ژیان و بۆ سێ کەس بەرنامەو ڕێنمایی تایبەتی هەبێت، چۆن بۆ میللەتان و جەماوەری سەرزەوی بەرنامەو سیستەمی تایبەتی نییە؟!! واجیب بوونی دانان و دەستنیشانکردنی سەرۆك لە دیدی ئیسلامیدا ئەوەندە ڕوون و ئاشکرایە هەموو گومان و دودڵییەك ڕادەماڵێت، چونکە کاتێك پێغەمبەری خوا ﷺ کۆچی دوایی کرد لاشەی پیرۆزیان بە خاك نەسپارد تا جێنشینی پێغەمبەریان ﷺ دیاریکردو سەرۆکی وڵاتیان هەڵبژارد، ئەمەش گرنگی و بایەخی ئەو مەسەلەیە دەردەخات، لە لایەکی تریشەوە ئیجماعی هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ هەیە لەسەر فەرزبوون و چەسپاندنی ئەو ئەرکە گرنگە لە دەسەڵاتی سیاسی ئیسلامیدا، بۆ ئەو مەبەستەش زانای بەناوبانگ تەفتازانی دەڵێت: "زۆرێك لە ئەرك و پێویستییە شەرعییەکان وەستاوە لەسەر دانان و بوونی سەرۆك، هەرشتێك واجبێکی لەسەر ڕاوەستێت خۆیشی دەبێتە واجیب و پێویست)، ئەمەش لەسەر ئەو بنەما شەرعییەی کە زانایان دایانڕشتووە (مالایتم الواجب الا به فهو واجب).

2- پیادەکردنی ڕاوێژو پرسوڕاگۆڕینەوە، خوای گەورە دەفەرموێت: (وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُم) (الشوری: 38)، واتە: (کاروباری نێو خۆیان بەپرس و ڕاوێژە)، شوراکردن پایەیەکی گرنگی دەسەڵاتی ئیسلامییە کە دەبێت سەرۆك پرس و ڕابکات و تاکڕەوی نەنوێنێت، دەبێت ڕاپرسی بکات بۆ ڕاپەڕاندنی کاروباری خەڵکی، چونکە لە بنەڕەتدا دەسەڵاتی ئیسلامی لەسەر بەیعەت دادەمەزرێت کە بریتییە لە گرێبەستێکی ئارەزوومەندانە،وە ئەو گرێبەستە لە نێوان حاکم و گەلدا

بەرەزامەندی هەردوولا و لەسەر چەند مەرج و بنەمایەك دادەمەزرێت، یەكێك لە بنەماكانی گرێبەستەكەش ئەوەیە كە كار بەپرس و ڕابێت و ڕاپرسی بكرێت ،و دوركەوتنەوە لە تاكڕەوی و دكتاتۆرییەت، ڕێگای گەشتن بە بڕیارو هەنگاوی كار لە ئیسلامدا بریتییە لە شوراكردن و مەشۆرەت بەرپاكردن، ئەم بنەمایەش لە سەردەمی پێغەمبەر ﷺولەپاش ئەویش لە كاروباری خەلیفەكاندا، بەرجەستە كراوە لە جوانترین و نایابترین شێوازەكانیدا، كە ئەویش بریتییە لە گفتوگۆكردن لەسەر كاروبارە گرنگ و بایەخدارەكان بە شێوەیەكی ئاشكراو لە مزگەوتدا، بۆ نموونە كاتێك مەسەلەیەك دەهاتە پێشەوە كە پەیوەست بێت بە بەرژەوەندی گشتیی و پەیوەند بێت بە خەڵكییەوە، لە مزگەوتەوە بانگ دەكران (الصلاه جامعه) پیاوان و ژنان بە تێكڕا كۆدەبوونەوە لە مزگەوت و خەلیفەش ئەو مەسەلەیەی كە خەڵكی بۆ كۆكردوەتەوە دەیخستە بەرباس و لێكۆڵینەوەی خەڵكەكە بە گشت چین و توێژەكانەوە تا لە دواجار دەگەشتنە بڕیارێكی دروست كە ئەمەش چلەپۆپەی ڕاپرسی و ڕاوەرگرتنی میللەت دەگەیەنێت، كە زۆر بەرزترو بەهێزتر بووە لە دیمكراسییەتی بازاڕی ئەسینا كە بە چلەپۆپەی دیموكراسییەت دانراوە، چونكە لە دیموكراسیەتی بازاری ئەسینا كاتێك خەڵكی بۆ كۆدەكرایەوە ژنان و بەندەكانی لیٚ دوور دەخرانەوە ،بەڵام لە شورای ئیسلامییدا هەموو بە شداری تێدا كردووەو كەس دوورە پەرێز نەخراوە، بەڵام شێوازی پرس و ڕاكردن و میكانیزم و شێوازی دەستنیشانكردنی ئەوانەی پرس و ڕایان پیٚ دەكرێت ئیسلام ئەو بوارەی بە كراوەیی هێشتووەتەوە بۆ هەر سەردەم و قۆناغێك، بۆ هەرشوێن و كاتێك چۆن بۆیان دەلوێت، چۆن بە لایانەوە باشە جێبەجیٚ بكرێت، گرنگ لەلای ئیسلام ئامانجە نەك میكانیزم و ئالیەتەكان، ئامانج لە سیستەمی ئیسلامی نەهێشتنی دیكتاتۆریەت و وەرگرتنی ڕای خەڵكەو نەهێشتنی تاكڕەوییە لە بڕیارو دەسەڵاتدا، ئەو دەسەڵاتە چۆن ئەم ئامانجە جێبەجیٚ دەكات ئازادن لەوەدا، لەبەر پیشاندانی بایەخدان بەو بوارە یەكێك لە سورەتەكانی قورئان ناونراوە (الشوری)، ئەبو هورەیرە دەڵێت: (مارایت احدا أكثر مشورة لاصحابه من رسول الله) واتە: (كەسم نەدیوە وەك پێغەمبەر ﷺ زیاتر پرس وراو مشۆرەت بكات بە هاوەڵانی) تورموزي ڕیوایەتی كردووە، وە عومەری كوڕی خەتاب دەڵێت (لا خير في امر أبرم من غير شورى)، واتە: (چاكەو خێر لە كارێكدا نییە بڕیاری لەسەر بدرێت و بڕێتەوە بەبێ ڕاوێژو ڕاپرسی كردن)، فەلسەفەی شورا لە ئیسلامدا لە كاتێكدا فەرزكراوەو كراوەتە پێویستی و بنەمایەك لە كاری سیاسی كە سوپای ئیسلامی لە جەنگی ئوحودا گەڕانەوەو شكست و گلان تووشی پێغەمبەر ﷺو هاوەڵانی بووبوو، لەكاتیكدا ڕۆشتنە دەرەوەی پێغەمبەر ﷺو سوپای ئیسلامیش بۆكێوی ئوحود لە سەرڕای زۆرینەبوو، پێغەمبەر ﷺ خۆی ڕای لەگەڵ ئەوەدا نەبوو كە سوپاكە بڕواتە دەرەوەی شار، وە پێی چاكتر بوو لە ناو شاردا بەرگری لە خۆیان بكەن، بەڵام لەگەڵ ئەو زیان و شكستەشدا خوای تاك تەنها قورئانی ناردە خوارەوە وفەرمانی كرد بە (وَشَاوِرْهُمْ فِي الأمْرِ) (ال عمران: 159)، واتە: (ڕاوێژیان پیٚ بكەن لە كاروباردا). بۆ ئەوەی هاوەڵانی پێغەمبەروپاش ئەوانیش خەڵكی بە گشتی بزانن كە مەشوەرەت كردن و ڕاپرسی نابێت بنیات بنرێت لەسەر سوود و قازانجێكی ڕووكەش، چونكە لەوانەیە هەندێكجار كار بە مەشوەرەت و زۆرینەی ڕاكان بكرێت بەڵام سەرئەنجامێكی چاكیشی نابێت، ئیسلام ئەوەی بەلاوە گرنگە كە بوار نەدرێت دكتاتۆر دروست ببێت و دیكتاتۆرییەت سەرهەڵبدات بە هەرناوو هۆكارێكەوە بێت، چونكە هەمیشە زیانەكانی دكتاتۆرییەت و تاكڕەوی زۆرترن لەو زیانانەی كە تووشی گەلان دەبێت لە ئەنجامی ئەو ڕاپرسیانەی بە زۆرینەی دەنگ كاریان پیٚ دەكرێت، لەوانەیە سەرئەنجامەكەی چاك دەرنەچێت، بەڵام وەك بنەمایەكی كاری سیاسی و بە شێوەیەكی گشتی هەمیشە كار بەڕای زۆرینە سەركەوتووترو بەهێزو تۆكمە ترە تا ڕای تاك و سەركردەیەك.

محمدی كوڕی سیرین بۆمان دەگێڕێتەوە كە دەڵێت: نموونەیەكی كرداری سەبارەت بە ڕاپرسی و ڕا وەرگرتن، عومەری كوڕی خەتاب ناوبانگی بە توندی و توڕەیی دەركردووە بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا كاتێك كێشەو گرفت و مەسەلەیەك بهاتەیەتە بەردەمی كە پەیوەست بێت بە كاروباری دەوڵەتەوە، یەكەمجار پرس و ڕای بە خەڵكی بە گشتی دەكرد، بە تایبەت گەنجان، هەروەها ئافرەتان، پاشان هاوەڵانی بەدرو پیرانی قورەیشی كۆدەكردەوەو ڕاوێژی پێدەكردن، هەروەها كۆمەڵی (القراء) كە خوێنەری قورئان بوون جا پیر بووبن یان گەنج

3. بەرپاکردنی دادگەری (وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ النَّاسِ أَن تَحْكُمُواْ بِالْعَدْلِ) (النساء: 58)، واته: (کاتێك دادوەرییتان کردوو بوونه دادوەر له نێو خەڵکیدا خوای تاكو تەنها فەرمانتان پێ دەكات كە بەداد حوکم بکەن)، ئەرکی دەسەڵاتی ئیسلامی بەرپاکردنی دادگەرییە بە هەموو شێوازو لە هەموو ئاستەكانداو لە گشت بوارێکدا، ئەمە هێڵێکی گشتییەو خوای تاكو تەنها زۆر بایەخیداوە بەوەی کەبنچینە لە دەسەڵاتدا چەسپاندن و بەرپا کردنی دادگەریە، لە دیدو بۆچوونی ئیسلامدا ئامانج لە دەسەڵاتو بەردەوامی لە دەسەڵاتدا بریتییە لە دادگەری، ستەمو ناڕەوایی سەرەتای داڕوخانو تیاچوونە، وە بەمەرج نەگیراوەچ بەرنامەو میکانیزمێك دەگیرێتەبەر بۆ بەرپاکردنی دادگەری ، ئایا لە ڕێگەی پێکهێنانی دەستەو ڕێکخراوی چاودێرییەوە دەبێت، یان وەزارەتێکی تایبەت بۆ ئەو کارە دادەنرێت، دەستنیشانکردنی میکانیزمەکان بەجێ هێڵراوە بۆ سەردەمە جیاجیاکانو نەوەکان بۆ ئەوەی بەپێی بارودۆخی ئەو کاتە دادگەری بەرپا بکەن، "مەبەستیش لە دادگەری لە بواری کۆمەڵایەتیو ئابووریو سیاسیو ڕۆشنبیریو ئیدارییە، نەك تەنها لە چەمکێکدا تەسك بکرێتەوە"، دادگەری بریتییە لەوەی هەموو هاووڵاتییەك بگاتە مافی خۆیو مافی خۆی پێبدرێت بەبێ هیچ منەتکردنێك، ئەوەش ئەرکی دەسەڵاتە، چونکە کاری حکومەت بریتییە لە خزمەتکردنو خزمەتگوزاری پێشکەشکردنو حەوانەوەی خەڵکی بەگشتیی، هەر کەسێكو بە پێی بارودۆخی خۆی، بەرپاکردنی دادگەری ئەرکە لەسەر حاکمو دەسەڵات دەبێت جێبەجێی بکات نەك مافێك بێت بیداتە خەڵك، خوای گەورە دادگەری فەرزکردووە لەسەر خۆیو لەسەر دەسەڵاتو لەسەر خەڵکی بەشێوەیەکی گشتی کە هەر کەسەو لە پلەو شوێنی خۆیدا دادگەری بەرپا بکاتو بە دادگەری بجووڵێتەوە، پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت: (ان لهم الائمة، حقا ولكم عليهم حقا مثل ذالك، ما ان استرحموا رحموا، وان عاهدوا وفوا، وان حكموا عدلوا، فمن لم يفعل ذالك منهم فعليه لعنة اللةو الملائكة والناس اجمعين)، ئیمام ئەحمەد ڕیوایەتی کردووە واتە: (کۆمەڵە مافێکتان لەسەرە بەرانبەر دەسەڵاتدارانو فەرمانڕەواکانتان، بەهەمان شێوە ئێوەش کۆمەڵە مافێکتان هەیە بەسەریانەوە، لە کاتێکدا داوای بەزەییان لێدەکرێت بەزەیی بنوێنن، لە کاتێکدا پەیمان دەدەن پێوەی پابەند بن، کە حوکم دەکەن دادگەر بن، هەر یەکێك لەوان بەو شێوەیە نەبێت نەفرەتی لێ بێتو بەدەربێت لە بەزەیی خواو فریشتەکانو خەڵکی بە تێکڕا)، باشترین ڕیگای دادگەری ئەوەیە کە یاسا حوکم بکاتو یاسا بەسەر هەموو لایەکدا جێبەجێ بکرێت، چونکە یاسا ڕێگری دەکات لەوەی کە سەرکردەکان جەماوەر فریو بدەنو بە مەزاجو ویستی خۆیان حوکم بکەن واتە: بوونی یاساو دەستور یەکەم زامنی بەرپاکردنی دادگەرییە ئەویش لە ئیسلامدا جێگیرو دامەزراوە کە بریتییە لە قورئان کە سنورو ئەركو مافەکان دیاری دەکاتو بۆ کەسیش نییە ئەو سنورە ببەزێنێت، وەك خوای گەورە دەفەرموێت: (وَأَنَّ هَـذَا صِرَاطِي مُسْتَقِيماً فَاتَّبِعُوهُ وَلاَ تَتَّبِعُواْ السُّبُلَ فَتَفَرَّقَ بِكُمْ عَن سَبِيلِهِ ذَلِكُمْ وَصَّاكُم بِهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ) (الأنعام: 153)، واتە: (خوای گەورە فەرمانیداوە کە بێگومان ئەمە کە قورئانە، ڕێگای ڕاستو دروستی منە، فەرمانتان پێدەکەم کە شوێنی بکەون، وەشوێن ڕێچکەکانی تر نەکەون، چونکە دوورتان دەخەنەوەو لاتان دەدەن لە ڕێبازی خوا، خوای گەورە ئەو ئەرکەی بە ئێوە ڕاسپاردووە بۆ ئەوەی پارێز بکەن و پارێزکار بن).

نموونەیەکی کرداریش لەسەر دادگەری، ئیبن جەوزی دەگێڕێتەوە کە عەمری کوڕی عاص هەستا بە چەسپاندنی سزاو سنووری خوایی لەسەر یەکێك لە کوڕەکانی عومەری کوڕی خەتاب لەسەر خواردنەوەی عارەق، بەڵام لە بەر ڕێزی خەلیفە عومەر سنووری عەرەق خواردنەوەکەی لە ماڵەوە بەسەردا چەسپاند کە لێدانی هەشتا دارە، کاتێك عومەری کوڕی خەتتاب ئەمەی بیست نامەی هەڕەشەو گلەیی نارد بۆ والی میسر کە عەمری کوڕی عاص بوو، داوای لێکرد کە بە گەشتنی نامەکە عەبدوڕڕەحمان بخاتە عەبایەکەوەو بە پێچراوەیی بۆی بنێرێت، کاتێك گەیەنرایە شاری مەدینە، عومەری کوڕی خەتتاب بە بەرچاوی خەڵکەوەو چۆن شەریعەت دایناوە بەو شێوەیە سنووری بە سەردا چەسپاند، تا خەڵك فێر بێتو بزانێت کە چەسپاندنی سنوورە شەرعییەکان جیاوازی ناکات لە نێوان کوڕی خەلیفەو کوڕی هاووڵاتییەکی تردا.

4. سەروەری بۆ شەریعەت (إِنِ الْحُكْمُ إِلاَّ لِلّهِ أَمَرَ أَلاَّ تَعْبُدُواْ إِلاَّ إِيَّاهُ ذَلِكَ الدِّينُ الْقَيِّمُ) (يوسف: 40) واتە: (بێگومان بڕیارو حوکم تەنها بۆ خوایە و فەرمانیداوە جگە لە خوا هیچ شتێك نەپەرستن، وە تەنها ئیسلام ئاینی ڕاستو دامەزراوو نەگۆڕە)،

ئەو دەسەڵاتەی پێغەمبەر ﷺ دایمەزراند دەسەڵاتیکی دەستووری بوو، لە پاش ئەویش خەلیفەکانو دەسەڵاتدارانی ئیسلامی لەسەر هەمان ریباز حوکمرانییان کرد، چونکە شەریعەت دەستوورێکی گشتگیرەو دەبێت حاکمو هاووڵاتی بەگشتی تێیدا ملکەچ بێت، جوداکردنەوەی چینی دەسەڵاتدارو هاووڵاتیان بەدی ناکرێت وەك لە شەریعەتەکانی کۆندا هەبوو کە گەلەکانیان دەکردە چەند توێژو چینێکەوە بۆ هەر چینو توێژێك یاساو ڕێنمایی تایبەت هەبوو، وەك لە یاسای ڕۆمانی کۆنو هیندی کۆندا بەدی دەکرێت کە گەلەکانیان دەکرد بە چوار چینەوە (چینی دەسەڵاتدار، سەربازو جەنگاوەرەکان، بازرگان، بەندەو جوتیاران)، یان لە هەندێك قۆناغەکانی دەوڵەتی ڕۆمانی خەڵکی کرابوونە دوو چین (هاووڵاتیانی ڕۆمانی، بێگانە) سەروەری شەریعەت مەبەست ئەوەنییە کە گەلو دەسەڵات سوود لە هیچ سەرچاوەیەکی تر وەرنەگرێتو تەنها سەرچاوەی یاساکان قورئان بێت، بە پێچەوانەوە هەر شەریعەت خۆی هانی دەسەڵاتی ئیسلامی و گەلانی موسڵمان دەدات کە هەوڵی سوودوەرگرتن بدەن لە سەرچاوەکانی تر بۆ کاروباری ژیان لە ڕووە جیاوازەکانەوە، خوای تاكو تەنها هانی بەندەکانی دەدات بۆ بیرکردنەوەو ڕوانینو سودمەند بوون بە (أَفَلاَ تَتَفَكَّرُون)و (أفَلاَ تنظرُونِ) ئاماژەی پێدە کات، یان لە کاتێکدا دەوترێت سەروەری بۆ شەریعەت مەبەست چەقبەستن نییە لە شەریعەتداو وازهێنان بێت لە عەقلو ئەزموونی گەلانو سوود وەرنەگرتن بێت لە زانستو تەکنەلۆژیاو تیۆرو بەرنامەکانی تر، بەڵکو شەریعەت بریتیە لە چوارچێوەیەکی گشتیو چەند بنەمایەکی دەستنیشان کردووە کە دەبێت هەموو مرۆڤایەتی لەو چواچێوەیەدا پابەند بن، گەر سەرنجیش بدەین دەبینین لە ئیسلامدا زۆرترینی دەقە قەتعییەکان لە قورئانو سوننەتدا پەیوەستن بە بواری عەقیدەو خواناسیو چۆنیەتی ڕەفتار کردنە لەگەڵ پایەکانی باوەڕو دروشمەکانی ئیسلام، بەڵام لە بوارەکانی تردا بە تایبەت لە بواری سیاسیو ئابووریو دەسەڵاتو یاساکاندا تەنها چەند هێڵێکی گشتی دیاری کردووەو بواری هێشتووەتەوە بۆ بیریارو زانایان کە ئیجتیهادی تێدا بکەن، جونکە زۆر کەس واتێدەگات کە دەوترێت دەقەکانی قورئان دەکرێتە سەرچاوەی دەسەڵاتو دەستور، مەبەست لێی ئەوەیە کە چەندین یاساو بەرنامە هەبووە لە کۆنداو لە کۆمەڵگاکانی ڕابردوودا بە هەمان شێوەو شێواز ئێستا جێبەجێ دەکرێت، ئەمەش بێگومان بۆچوونێکی هەڵەیەو کەمئەزموونی ئەو کەسانە نیشان دەدات کە ئەو جۆرە بۆ چوونانە دەردەبڕن، چونکە دەرگای ئیجتیهادو بیرکردنەوە لە ئیسلامدا والآیەو فەتواو بڕیارەکانیش بە پێ کاتو شوێنو تەنانەت مرۆڤەکانیش گۆرانی بە سەردا دێت، وە بە هۆی نەرمی بنەماکانی شەریعەتەوە دەتوانرێت ئەو بنەمایانە بگونجێنرێت لەگەڵ هەموو پێشهاتو گۆڕانکارییەکاندا، لەگەڵ هێشتنەوەو بەردەوامی لەسەر ڕەسەنایەتیو دیدو بۆچوونە جێگیرەکان، یان هەندێك وا تێگەیشتووە لە سەروەری کە بریتییە لەوەی بوار بە عەقڵو زانستو ڕای خەڵکی نادرێت، وە لە دەستورو یاسای وڵاتانی تر سوود وەرناگیرێت، وەك لە سەرەتاوە ئاماژەمان پێکرد ئیسلام تەنها قورئانی نەکردووە تە تەنها سەرچاوە بۆ کارو بەڕێوەبردنی ژیان، هەرچەندە یەکەم سەرچاوەیە بەڵام تەنها سەرچاوە نییە لە کاتێکدا (قورئان وسوننەت) بە دوو سەرچاوەی بنەرەتی دادەنرێت ،بەڵام سەرچاوەی تریش دیاریکراوە کەبریتیە لە بەرهەمی عەقڵو بیرکردنەوەو لێکۆڵینەوەی زانایان، کە پێیان دەووترێت سەرچاوەی پاشکۆییەکانوبە تەواوکەری ئەو دوو سەرچاوەیە بنەڕەتییە دادەنرێن، وەك عورف کە بەشێکی زۆری کاروباری ژیانی هەموو میللەتان لەسەر عورف دەروات، لەم حاڵەتەدا سەروەی بۆ ئیسلام مەبەست لێی هەڵوەشاندنەوەی هەموو نەریتو عورفەکانی میللەتان ناگەیەنێت، بەڵکو تەنها ئەو عورفانە لادەدات کە لەگەڵ دەقێکی قەتعی قورئاندا پێچەوانە بێت، کە ئەویش بێگومان لەگەڵ بەرژەوەندی خەڵکیدا یەك ناگرێتەوە،و لە ویێناوەشدا ئیسلام قەدەغەی کردووە، بەڵام هەموو ئەو شتانەی تر کە بووەتە عورف ونەریتی باوو خەڵکی لە سەری ڕاهاتووە ئیسلام ڕێگیری لێناکات، نموونە لەسەر ئەو عورفانەی کە ئیسلام ڕێگری لێدەکات لە یاسای باری کەسێتیداله رابردوودا ولەناو زۆربەی کۆمەڵگەکاندا عورفێکی کاری پێکراوە بووە کە  مارەیی ئافرەت وەلییەکی زەوتی کردووە بردویەتی بۆ خۆی، بەڵام کە ئیسلام هات بڕیاریدا مارەیی مافی ئافرەتەو دەبێت بدرێتە ئافرەت (وَآتُواْ النَّسَاء صَدُقَاتِهِنَّ نِحْلَةً) (النساء: 4)، واتە: (بیدەنە ئافرەتان خۆیان نەك کەسوکاریان مارەییەکانیان وەك بەخشین نەك کری). نموونە لەسەر ئەو عورفانەی کە ئیسلا م

بواریداوە کاری پیٚ بکریٚت، بوونی حەصانە بۆ نویٚنەرانی دبلۆماسی ولاٚتانو تەفتیش نەکردنیان لەکاتی هاتوو چۆیان بۆ ئەو ولاٚتەی کە کاری تیٚدا دەکەن.

جگە لە عورف چەندین سەرچاوەی پاشکۆیی ترهەن وەك ئیجماعو قیاسو ئیستحسانو مەصلەحەتو کردنەوەو داخستنی زەریعە ئەمانەش هەمووی سەرچاوەن بۆ دەستوورو کاروباری خەلکی لە هەموو بوارەکانی دینیو ئابووریو کۆمەلاٚیەتیو رۆشنبیریدا، ئەم سەرچاوانە عەقلٚینو پشت دەبەستیت بە ئیجتیهادو رای زانایانو پسپۆران لە بوارەکانی خۆیاندا، کەواتە لە ئیسلامدا زۆربەی سەرچاوەکان لەسەر بنەمای ئیجتیهاد و بیرکردنەوە دامەزراوە، بە تایبەت لە بواری سیاسیدا، سنورو پانتاییەکی فراوان دراوەتە عەقلو بیری خەلکی، کە چۆن چاك بیٚتو بەرژەوەندی خەلك چۆن بیٚت بۆیان هەیە وا بڕیار بدەنو وا هەلسووکەوت بکەن، بەلگەش لەسەر ئەوە دەبینین خوای کاربەجی لە قورئاندا لە (49) ئایەتدا کاری عەقلٚو ژیری ئاماژە پیٚ کردووە لە کاتیٚکدا لە (32) ئایەتدا ئاماژەی بە دلٚو دەرون و کاری دلٚ کردووە، کە ئەمەش ئاماژەیە بە گرنگیدان بە عەقلٚو بیرکردنەوەو پشتبەستن بە وردبوونەوە بە عەقلٚ بۆ کاروبارەکان، لە بواری کرداریشدا کاتیٚك پیٚغەمبەر ﷺ مەعازی کوڕی جەبەلی نارد بۆ یەمەن بۆ ئەوەی ببیٚتە والی لەو هەریٚمەدا پیٚی فەرموو: بەچی حوکم دەکەیت؟ وتی: بە قورئان، پیٚغەمبەر ﷺ فەرمووی: گەر لە قورئاندا دەق نەبوو؟ وتی: بە سوننەت، وتی: گەر لە سوننەتدا دەق یان ڕووداوت دەست نەکەوت؟ وتی ئیجتهاد دەکەم بە بۆچوونی خۆم)، ئیمام ئەحمەد ڕیوایەتی کردووەوە، ئەمەش ئەوگومانو دودلٚیە هەلدەوەشیٚنیٚتەوە کە زۆرکەس وا هەستدەکەن کە ئیسلام گەیشتە دەسەلاٚت بوار بۆ عەقلو بیرکردنەوەو بەرژەوەندی خەلٚكو گۆڕانکارییەکان نادات. سەروەری مەبەست پیٚی کۆتکردنی عەقلو ژیان نییە خوای تاكو تەنها کە ئیسلامی ناردووە مەبەستی کارئاسانیو ڕیٚکخستنی کاروباریانە نەك قورسکردنو تەنگ پیٚ هەلچنین (يُرِيدُ اللّهُ بِكُمُ الْيُسْرَ وَلاَ يُرِيدُ بِكُمُ الْعُسْرَ) (البقرة: 185)، واتە: (خوا ئاسانی دەویٚت بۆ ئیٚوە، گرانی ناویٚت بۆتان)، لە کۆتاییدا سەروەری واتە ئەو سەرچاوە پاكو بیٚگەردەی کە پیٚویستە لە کاتی ناکۆکیو کیٚشەو ناڕیٚکی نیٚوان دەسەلاٚتو خەلٚك یان کیٚشەو ناکۆکییەك کە بیٚ چارەسەر مایەوە یان ئیجتهادو بیرکردنەوە نەگەشتنە بڕیاری دروستو بەجیٚ، دەبیٚت بگەڕیٚنەوە لای بەرنامەی پەروەردگارو پابەندبن بەدەقو ڕیٚنماییەکانییەوە (وَمَا اخْتَلَفْتُمْ فِيهِ مِن شَيْءٍ فَحُكْمُهُ إِلَى اللَّهِ) (الشوري:10)، واتە: (هەرشتیٚك کە تیٚیدا جیاواز بوون ئەوە بڕیارەکەی بۆ لای خوا دەگەڕیتەوە).

5. دەسەلاٚت بۆ گەلو جەماوەرە، یەکەم جیٚنشینی پیٚغەمبەر ﷺ ئەبوبەکر (ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لیٚ بیٚت) وتوویەتی: (ان الله قد رد عليكم امركم فامروا من احببتم)، واتە: (خوای تاكو تەنها ئەم کارەی گەڕاندووەتەوە بۆ خۆتانو خۆتان کیٚتان پیٚ خۆشە بیکەنە گەورەو سەرۆکتان)، دەسەلاٚتی سیاسی لە ئیسلامدا دەگەڕیٚتەوە بۆ میللەتو تەنها جەماوەر خاوەن بڕیارو دەسەلاٚتە ئەویش لە سیٚ بواردا دەردەکەویٚت لە (دانانی دەسەلاٚتداران، لادانیان، چاودیٚریکردنیان) ئەمە ئامانجو مەبەستە، بەلاٚم شیٚوەی دانانو میکانیزمی لادانیانو ئالیەتی چاودیٚریکردنیان ئەوە دەگەڕیٚتەوە سەر میللەت خۆیو ئەو دەستورەی کە دانراوەو چۆنییەتی ڕیٚکخستنی پەیوەندییەکانی نیٚوان سەرکردەو جەماوەر، بۆ نموونە دانانی سەرۆك لە دەسەلاٚتی جەماوەرە، بەلاٚم ئایا هەلبژاردنی بە شیٚوەیەکی ڕاستەوخۆ دەبیٚت یان بە ناڕاستەوخۆو لەلایەن ئەنجومەنی نویٚنەرانەوەئەنجام دەدریٚت؟، ئەوە ئیسلام دەرگای والاٚکردووە کە خەلٚك خۆیان ئازاد بن لە شیٚوەی هەلبژاردنەکەدا، لە کاتیٚکدا خوای بالاٚدەست بڕیاری داوە دەبیٚت دیاریکردنی دەسەلاٚتداران بەپرسو ڕای خەلك دەبیٚت، بەلاٚم میکانیزمی پرسو ڕاکەی هیٚشتووەتەوە بۆباروودۆخی هەر میللەتەو شیٚوەو شیٚوازی ژیان لە هەر قۆناغیٚکدا، ئایا بە ڕیفراندۆمی گشتی سەرۆك دەست نیشان دەکەن ؟، یان ئەنجومەنی نویٚنەران هەلٚی دەبژیٚرن؟، هەروەها سە بارەت بە شیٚوازی چاودیٚری دەسەلاٚت ئایا لەسەر بنەڕەتی لیٚژنەو وەزارەت دەبیٚت؟ یان ڕیٚکخراو دەزگای تایبەتی بۆ دادەنریٚت؟، لیٚرەدا ئەوەمان بۆ دووپات دەبیٚتەوە نەك تەنها دانانو لادانو چاودیٚری دەسەلاٚتو دەسەلاٚتداران لە دەست گەلو جەماوەردایە بەلٚکو میکانیزمو شیٚوەی ئەو کارانەش خراوەتە دەست جەماوەر کە چۆنیان بۆ دەلویٚتو چۆن بەرژەوەندییەکانیان دیٚتەدی تیٚدا ئازادنو کەس بۆی نییە ڕیٚگرییان لیٚ بکات. بنەڕەت هەلبژاردنو دەستنیشان کردنە لە لایەن جەماوەرە، بەلاٚم لە هەندیٚك

قۆناغدا كە سیستەمی هەڵبژاردن بووەتە ڕێككەوتن یان میراتگری ئەوە لادان بووە لە یەكێك لە بنەماكانی سیستەمی ئیسلامی وەك لە سەردەمی ئومەوییەكان‌و عەباسییەكاندا ڕوویداوە هەروەك ئیمامی ماوەردی لە سەر زوبانی ئەبو یەعلا لە (الاحكام السلطانية)دا دەڵێت: (دروست نییە بۆ سەرۆك‌و حاكم كە پەیمان بدات‌و پەیمان وەربگرێت لە خەڵك بۆ سەركردەو حاكمێك لە پاش خۆی، دانانی حاكم بە میراتگری‌و پەیماندان‌و پەیمان وەرگرتن گرێبەستی ئیمامەت نییە)، ئیبن تەیمییەش ئەم ڕاستیە دووپات دەكاتەوە كە دەڵێت: "پێشەوایەتی‌و سەرۆكایەتی جێگیر دەبێت بە ڕەزامەندی دەسەڵاتدارانی ناو گەل، كەسێك نابێتە پێشەواو سەرۆك تا خاوەن قسەو دەسەڵاتدارانی گەل ڕایان لەسەر نەبێت)، مەبەستیش لە خاوەن دەسەڵات بریتییە لە زانایان‌و سەرۆك عەشیرەت‌و سەركردە سەربازییەكان‌و سەركردەی هەرێمەكانی ئەو گەلە كە پێیان دەوترێت ئەهلی (حەل‌و عەقد)"، نووسەری ئیسلامی (سەروەت بەدەوی) ئەم بنەمایەی داڕشتووە بە شێوەیەكی سەردەمانە بە پشتبەست بەمومارەسەی سیاسی ڕابردوو لە دەسەڵاتی ئیسلامیدا كە دەڵێت: "هەڵبژاردنی خەلیفە بە دوو قۆناغدا تێدەپەڕێت قۆناغی (پاڵاوتن‌و دەستنیشان كردن) كە ئەویش یان بە ڕێگەی دەستنیشانكردن دەبێت لە لایەن سەرۆك‌و پێشەوای پێشوو بەڵام نەك لە بنەماڵەی خۆی‌و لەسەر بنەمای میراتگری بێت، بەڵكو وەك پێشنیاریان پاڵاوتنی ئەو سەرۆكەو پاشان پەسەندكردنی لە لایەن ناودارانی گەلەوە وەك زانایان‌و سەركردە سیاسی‌و سەربازییەكان، وە قۆناغی دووهەم بریتییە لە بەیعەتكردن لە مزگەوت كە لە شێوەی ڕیفراندۆمێكی جەماوەریدایە"، كرداری بەیعەت كە یەكێكە لە دروشمە ئیسلامییەكان ئەو ڕاستیە دەسەلمێنیت كە دەسەڵات دەگەڕێتەوە بۆ گەل،وەك لە دانانی سەرۆكدا بەرجەستە دەبێت، چونكە بەیعەت گرێبەستێكەو دەبێت هەردوو لای گەل‌و حاكم لە سەری ڕازی بن‌و پابەندبن بەو مەرجانەی كە هەیانە لەسەر یەكتر، وە بەیعەت دان بە ڕەزامەندی دەبێت‌و گرێبەستێكە لەسەر ڕەزامەندی هەردوولا دادەمەزرێت‌و گەر هەر هۆكارێكی وەك فشارو هەڵخەڵەتاندن‌و هەڵەی تێدا ئەنجام بدرێت دانامەزرێت‌و بەتاڵدەبێتەوە ، وەك ئیبن خەلدون دەڵێت: "بەیعەت گرێبەستێكەو ئیتیفاقێكی ئیرادییەو دەبێت بەشێوازێك لە شێوازەكانی تەعبیركردن ئاماژەی پێبكرێت كە لەگەڵ ئازادی‌و سەربەستی تاكەكاندا ناكۆك‌و نارێك نەبێت". دەوڵەت‌و دەسەڵاتی سیاسی پێغەمبەر ﷺ لە شاری مەدینە لەسەر بنەڕەتی هەردوو بەیعەتی عەقەبەی یەكەم‌و دووهەم دامەزرا، بەوشێوەیە دەبینین بەیعەت لە دەسەڵاتی ئیسلامیدا گرێبەستێكی ئارەزومەندانەی نێوان خەڵك‌و حكومەتە، ئەم دیاردەیە لە واقیعدا جێبەجێ بووەو پراكتیزە كراوەو چەندین جار دووبارە بووەتەوە لە مێژووی ئیسلامدا بەڵام (جان جاك ڕۆسوو هۆبزو لۆك) وەك گریمانەیەكی خەیاڵی باسیان كردووە لە تیۆری گرێبەستی كۆمەڵایەتیدا.

6. سەربەخۆیی دادگاكان: ئەمەش بە كردەیی لە پیادەكردنی دەسەڵاتی سیاسی ئیسلامیدا دەركەوت هەر لەگەڵ دانانی یەكەم جێنشینی پێغەمبەر ﷺ جێبەجێكرا كە ئەبوبەكر كرایە جێنشینی پێغەمبەر ﷺ هەستا بە دانانی عومەری كوڕی خەتتاب بۆ ڕاپەڕاندنی كاروباری قەزاوەت‌و دادگەری، لە سەردەمی خیلافەتی عومەری كوڕی خەتتابدا دەسەڵاتی دادگەری بە تەواوی جیاكرایەوەلە دەسەڵاتی عەسكەری‌و ئیداری‌و دارایی، بۆ نموونە:

1. عەبدوڵڵای كوڕی مەسعودی كردە قازی لە كوفە، لە كاتێكدا عەمماری كوڕی یاسری كردبووە والی كوفە.

2. سەلمانی كوڕی ڕەبیعەی كردە قازی میسرو عەمری كوڕی عاص والی بوو.

3. لە شاری مەدینە ماوەیەك عەلی كوڕی ئەبوتالیب قازی بوو وە ماوەیەك زەیدی كوڕی سابت، لە كاتێكدا عومەری كوڕی خەتتاب لە شاری مەدینە بووەو سەرۆكی دەوڵەت بوو.

4. ئەبو موسای ئەشعەری كردە قازی بەصرە، لە كاتێكدا موغیرەی كوڕی شوعبە والی بووە.

لە پاش ئەوانیش تا ڕوخاندنی دەوڵەتی عوسمانی دەسەڵاتی قەزایی جیاو سەربەخۆو خاوەن پلەو پایەیەكی بەرز بووە،وە لە ناو دەسەڵاتی سیاسی ئیسلامیدا هیچ كەس(حصانە)ی تایبەتی نییە لەبەردەم دادگاكاندا، بۆ نموونە جارێكیان كێشەیەك دروست بوو لە نێوان عومەری كوڕی خەتتاب لەگەڵ ئوبەی كوڕی كەعب، لەسەر دیوارێك، هەردووكیان ڕۆشتن بۆ ماڵی زەیدی كوڕی سابت كە حوكمیان بكات، كاتێك زەید عومەری كوڕی خەتتابی دی هەستاو

شوێنەکەی خۆی چۆڵ کرد تا عومەر تێیدا دابنیشێت، بەڵام عومەر وتی هاتووین حوکممان بکەیت، زەید هەردووکیانی دانا لە بەردەم خۆیداو حوکمی کردن، شێوازی دادگاکان‌و چۆنییەتی کاری دادگاکان‌و بنەماو هەڵبژاردنی قازی بۆ دادگاکان‌و میکانیزم‌و ئالیەتەکانی کارکردن لە دادگادا بە شێوەیەکی ورد لە کتێبە فیقهییەکاندا تۆمار کراون، بەڵام دەسەڵات‌و ڕەوتی کاری دادگاکانیش لەگەڵ ڕەوتی ژیان‌و پێشکەوتنەکان، گۆڕان‌و پێشکەوتنی بەسەردا هاتووە ،وەك نموونە پاش فراوانبوونی دەوڵەتی ئیسلامی لە سەردەمی عەباسییەکاندا پلەی (قاضي قضاة) هاتە کایەوە کە بەرپرسی هەموو دادوەرەکانی دەوڵەتی خرابوویە ئەستۆو چاودێری کاری دادگاکانی دەکردو ڕاستەخۆ بەرپرس بوو لە هەڵبژاردن‌و لادانی هەموو دادوەرەکان. لە دەوڵەتی (مورابتین) ئەنجومەنی ڕاوێژ دانرا بۆ (قاضي القضاة) کە هیچ بڕیارو حوکمێکی دەرنەدەکرد تا ڕاویژی نەکردایە بە ئەنجومەن کە لە کۆمەڵێك فوقەهاو زانای ئەو کاتە پێکهێنرابوو، هەر لە دەوڵەتی مورابیتن دادگای سەربازی هاتە کایەوە کە تایبەت بوو بۆ چارەسەری کێشەی سەربازەکان ئەمەش بۆ کارئاسانی هاووڵاتیان‌و تایبەتمەندی وەرگرتن لە دادگاکاندا، هەروەها دادگایەکی تایبەتی دانرا بۆ جوولەکەو گاورەکان‌و دادوەری خۆشیان بۆ دانرا بۆ چارەسەری کێشەکانی ناو خۆیان بەپێی دینی خۆیان، کە ئەمەش بەڵگەیە کە دینی ئیسلام خاوەن بەرنامەو سیستەمی خۆیەتی بۆ کاروباری دەسەڵات ئەو بەرنامەیەش هەمیشە لە پێشکەوتن‌و گۆڕاندایە بۆ بەدیهێنانی پێداویستییەکانی ژیان، لە هەمان کاتدا ئەو پەڕی ئازادی‌و مافدانیش دەسەلمێنێت بەرانبەر بە دینەکانی تر.

7. پاراستنی ماف‌و ئازادییە گشتییەکان: پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (کل المسلم علی المسلم حرام دمه وماله وعرضه) واتە: (هەموو موسڵمانێك لەسەر موسڵمانێکی دی حەرامە خوێن‌و ماڵ‌و ناموسی) وە عومەری کوڕی خەتتاب دەڵێت: (متی استعبدتم الناس وقد ولدتهم امهاتهم احرارا)، واتە: (بە چ مافێك خەڵکیتان کردووەتە بەندە لە کاتێکدا بە ئازادی لە دایکبوون)، لەسەر دەسەڵات پێویستە کە ئازادی‌و مافەکان بۆ هەموو هاووڵاتییەکی ژێر دەسەڵاتی خۆی دابین بکات بێ ڕەچاوکردنی دین‌و ڕەگەز‌و نەژادو ڕەنگ، بەتایبەت پێنج پێداویستییە زەرورییەکانی ژیان کە بریتییە لە (دین‌و عەقڵ وماڵ‌و گیان‌و وەچە) وە مەبەست لە دین تەنها دینی موسڵمان نییە، بەڵکو دەسەڵاتی ئیسلامی سەربەستی ڕەهاو بەرفراوانی داوە بە دین‌و بەرنامەکانی تر ئەمەش تەنها بەدروشم‌و دەق دەستنیشان نەکراوە، بەڵکو بە کردەوە سەلمێنراوەو بەڵگەو ڕوداوە مێژووییەکان ئەم ڕاستییە دووپات دەکەنەوە بۆ نموونە: لە کاتێکدا سوپای ئیسلامی ناوچەکانی میسرو سوریاو عێراقیان کەوتە بندەست‌و دەسەڵاتیان پەیدا کرد، چەندین هۆزو بنەماڵەو عەشیرەت دینی مەسیحی‌و جوولەکەیان هەبوو نەك لەو کاتەشدا بگرە تا چەرخی بیستەم کەنیسەو شوێنی خواپەرستی ئەوانیش ماونەتەوە لە شوێنەکانی خۆیانداو کەس دەستدرێژی نەکردونەتە سەرو عورف‌و دین‌و شێوازی ژیانیان بە ویست‌و ئارەزوی خۆیان پیادە کردووە وەك لە کوردستان لە سلێمانی‌و هەولێرو دهۆك‌و شوێنەکانی تر تا ئێستا کەنیسەو شوێنی خواپەرستی‌و تەقالیدی خۆیان دەکەن، جوولەکەکان گەر دەسەڵاتدارانی نەتەوەی وڵاتە عەرەبییەکان بەزۆر یان لە ژێر فشاردا کۆچیان پێ نەکردنایە تا ئێستاش دەمانەوە، چونکە تا کۆتایی ساڵەکانی 1950ز جوولەکەکانی کوردستان گەڕەك‌و شوێنی خواپەرستی خۆیان هەبوو، کەس فشاری نەخستوونەتە سەر بۆ گۆڕینی دین‌و بەرنامەیان، هەروەها لەکاتێکدا دەسەڵاتی ئیسلامی گەشتوەتە سندو چین‌و هیندو ڕوسیا چەندین تایفەو عەشیرەت‌و بنەماڵە هەریەکەیان جۆرە دینێکی هەبووە وەك بوزییەکان‌و هیندۆس‌و سیخ لەژێر دەسەڵاتی ئیسلامیدا بوون، ئیسلام حاکم بووە لەوناوچانەدا بەڵام مانەوەی تەقالیدو زوبان‌و شوێنی خواپەرستی ئەو هۆزەو تایفانە بەڵگەی بێ لەکەن بۆ ڕاگرتنی هەستی هەموو کەسێك‌و ئازادی دانە بە هەموو کەسێك لە ڕووی عەقیدەو کەس بەزۆر نەیویستوە فیکرو عەقیدەیان بگۆڕێت، هێزو زەبرو زۆر بەکارنەهینراوە بۆ بەموسڵمانکردنی خەڵکی بە دریژایی ئەو سیانزە سەدەو نیوە، گەر پێچەوانەکەی ببوایە ئێستا ئاسەواری هیچ لەو دینانە نەدەماو شوێنکەوتووەکانیان ون دەبوون لە لاپەڕەکانی مێژوودا، بەڵام مانەوەو بەردەوامبوونی خەڵك‌و شوێنەوارەکانیان بە سەلامەتی بەڵگەی بێ لەکەن لەسەر ڕێبازی پاراستنی ئازادی لەلایەن دینی ئیسلامەوە بەرانبەر بە کەمینە ئاینی‌و پاراستنیان لەهەر مامەڵەیەکی ناشایستە، بنەمای سەرەکی‌و بنەڕەتی لەم بوارەدا ئەوەیە کە

قورئان دەفەرمویت: (لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّين) (البقرة: 256)، واتە: (بە هیچ جۆرێك زۆرکردن لە دیندا نییە بۆ هاتنە ناو ئیسلام)، تەنانەت عومەری کوڕی خەتتاب بەندەیەکی گاوری هەبووەو ناوی (أشق) بووە، بەردەوام لە ماڵو لەبەردەست خەلیفەدا کاری کردووەو پێش ئەوەی شەهیدیش بێت ئازادی کردو ڕۆژێك فشاری نە خستوەتە سەر بۆ ئەوەی بە زۆر بیکاتە موسڵمان، ڕێزلێنانو پاراستنی مافەکانی مرۆڤ پەیوەست نییە بە دینەکەیەوە، بەڵکو ئیسلام لەسەرەتاو بنەڕەتدا لەسەر بنەمای مرۆڤایەتی مامەڵە دەکات لەگەڵ مرۆڤەکاندا (وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ) (الاسراء:70)، واتە: (سوێند بەخواو بێگومان ڕێزمان لە نەوەی ئادەم گرت)، هیچ کات تۆڵەو تاوانی کەسێك ناخرێتە سەر کەسێکی تر هەموو کەس بەرپرسیارە لە کارو کردەوەی خۆی، مرۆڤ ئازادەو ئیرادەی بەدەست خۆیەتی (أَلَّا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى) (النجم: 38)، واتە: (هیچ تاوانبارێك گوناهی هیچ تاونبارێکی تر هەڵناگرێت).

8. الحسبة: (كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ) (ال عمران: 110)، واتە: (ئێوەی موسڵمانان چاکترین گەلێك بوون بۆ خەڵکی کە هاتوونەتە بوون کە فەرمان دەدەن بە چاکەو ڕێگری دەکەن لە خراپە)، دەزگای فەرماندان بە چاکەو بەرگری لە خراپە دەزگایەکی چاودێری گشتییە دەبێت دەسەڵاتی ئیسلامی دایمەزرێنێت بۆ ئاگاداربوون لە ڕەوتو کاروباری دەزگاکانی حکومەت، چاودێری دەزگاو فەرمانبەرانی حکومەتو هاووڵاتیانیش بە گشتی دەکات بۆ ڕێگرتنیان لەوەی کە ستەم بکەنو خراپە بەرانبەر بە هاووڵاتیان ئەنجام بدەن لە هەموو بوارەکانی تەندروستیو داراییو کۆمەڵایەتیو سیاسی، ئەم دەزگایە گەڕۆکەو خۆیان ڕاستەوخۆ دەبێت بگەڕێنو کەموکورتییەکان دەستنیشان بکەنو دەبێت پەیوەندی بکەن بە شوێنە گشتییەکانو شوێنی کاری خەڵكو بە تایبەت بازاڕو کارگەو شوێنی حەوانەوەی خەڵکیو دامودەزگاکانی حکومەت،ئەمەش بۆ نەهێشتنی ڕۆتینی ئیداریو خێرا بەدەمەوەچوونی هاووڵاتیانە لە کاتی ستەم لێکردنیان، وە گەورەترین سیمای ئەم دەزگایە ئەوەیە خۆی چاودێری دەکاتو هەوڵی ئەوە دەدات کە ناتەواویو ناڕێکی دەسەڵاتو کاری ستەمکاران نەهێڵێت نەك چاوەڕێ بکات تا هاووڵاتییەك یان دەزگایەك سکاڵایەك بەرز بکاتەوە، ئەم دەزگایە پێکدەهێنرێت بۆ بەرگری لە ستەم لێکراوانو مافخوراوان و ئەوانەی کە ترسیان هەیە سکاڵا بەرز بکەنەوە لە ترسی تۆڵەو خراپە نواندن، ئەم دەزگایە چاودێرە بەسەر هەموو دەسەڵاتە جیاوازەکانی حکومەت، لە ئیسلامدا هیچ کەسو بنەماڵەو دەزگایەك لە سەرو یاساوە نییەو نابێت کەس چاوپۆشی لێ بکرێت لە چاودێری کردن، ئەوەی بەڵگەنەویستە تەنها دەسەڵات ستەم ناکات، چونکە زۆرجار هاووڵاتیان ستەم لە یەکتری دەکەن، هەندێك جار هاووڵاتیان دەستدرێژی دەکەنە سەر ماڵی گشتیو خراپە دەکەن بەرانبەر بە بەرژەوەندییە گشتییەکان، ئەم دەزگایە ئەو هێز داپڵۆسێنەرە نییە کە زۆرکەس یان تۆقیوە یان تۆقێنراوەو وادەزانێت بە شەلاقو لێدانو بەزۆر نوێژ بە خەڵك بکات و ڕۆژوو فەرز بکاتو بەزۆر حیجاب بە ئافرەتان بپۆشێت، بە پێچەوانەوە ئەم دەزگایە بۆی نییە ماف و ئازادییەکان پێشێل بکاتو بەپێی یاسایەك کە ئەویش هێڵە گشتییەکانی بۆ دیاری کراوە کاری چاودێری ئەنجام دەدات لەگەڵ پاراستنی مافو ئازادیو داخوازییەکانی خەڵك، دەزگایەکە بۆ بەدەمەوەچوونی خەڵك، ئێستا نموونەی ئەو دەزگایانە هەیە بەڵام ئەزموونێکی سەرکەوتوویان نییەو کەمتەرخەمی دەنوێنن لە کارەکانیاندا، بۆنموونە (الرقابة الماليَة) لە زۆرێك لە وەزارەتەکاندا بوونی هەیە (الرقابة الصحية) لە زۆربەی وڵاتەکاندا هەیە، ئەم دەزگایە فەرمان دەکات بە چاکەو بەرگری دەکات لە خراپە لە سێ بواردا (مافی خوا – مافی خەڵكو مافی هاوبەش –)، مافی خوا بۆ ئەوە نییە خەڵك بەزۆر نوێژ پێ بکات، بەڵکو گەر یەکێك هەستاو دروشمێکی ئیسلامی کە خۆی هەبووە نەهێڵێت یان بوارنەدات بکرێت ئەو دەزگایە دەیگەڕێنێتەوە شوێنی خۆی، بۆنموونە" بانگدان گەر نەهێڵرێت بانگ بدرێت یان نوێژی جومعە لابدرێت بەهەر بیانوویەکەوە بێت، مافی خەڵکیش وەك دواخستنی قەرزو ئیحتیکار، وەمافی هاوبەشیش وەك بارکردنی پاپۆڕێك بە بارێك کە زیاتر بێت لە کێشی خۆیو ببێتە هۆی نقومبوونی سەرنشینەکانی، یان دۆزینەوەی شتێكو بایەخ پێنەدانی، دەبینین کاری ئەم دەزگایە زیاتر ئەو مەسەلانە لەخۆ دەگرێت کە پەیوەستن بە مرۆڤو ژیانو بەرژەوەندییەکانی مرۆڤەوە، نەك تەنها دروشمە ئیسلامییەکان، فەرماندان بە چاکەو ڕێگری لە خراپە لە دیدگای ئیسلامەوە واجیبو پێویستی سەرشانی هەموو موسڵمانێکی پیاوو ئافرەتە، ئەم پێویستییەش بنیاتنراوە لەسەر بوونی ئازادی ڕەخنەگرتنو بواردان بە تاکەکان بۆ

دەربڕینی ڕاو ڕەخنەی خۆیان بەرانبەر بە دەسەڵاتی ئیسلامیی، چونکە تا سەربەستیی و ئازادی ڕادەربڕین و ئازادی سیاسی نەبێت بێگومان تاکەکان ناتوانن هەستن بەو ئەرکە گرنگە، ئەمەش وا دەخوازێت کە دەسەڵاتی ئیسلامی ئازادی دابین بکات بۆ هاووڵاتیان تا بتوانن بە ئەرکی سەرشانی خۆیان هەستن. بازنەی فەرماندان بە چاکەو ڕێگری لە خراپە تەنها سنوری حەڵاڵ و حەرام ناگرێتەوە، بەڵکو زۆر جار هەندێك کاری دروست و موباحیش دەگرێتەوە کە لە خودی خۆیدا دروست و حەڵاڵە بەڵام لە هەندێك کات و شوێنی دیاری کراودا ئەو حەڵاڵ و دروستبوونە دەگۆڕێت بۆ کارێکی ناڕەوا و نادروست، بۆ نموونە، لە کاتێکدا میللەت برسی بێت و پێویستی بە خواردن بێت حاکم هەستێت بە بنیاتنانی تەلار و کۆشك بۆ ئاوەدانکردنەوەی وڵات لەم کاتەدا دەبێت دەستی ئەو حاکمە بگیرێت و بەرگری بکرێت لەو کارە، چونکە لە ئیسلامدا خەڵك و مرۆڤ لە پێشترە بۆ پاراستن و هێشتنەوەی تا بوونی کۆشك و تەلار، ئەم ئەرکە ماف نییە بەڵکو پێویستیی و واجبێکی گشتییە بەسەر خەڵکییەوە.

**سێیەم:**

هەندێك لە نووسەران بۆ سەلماندی ئەوەی گوایە ئیسلام هیچ پەیوەندیەکی بە سیاسەتەوە نیە بەڵگە بەوە دەهێننەوە گوایە چەند دەقێکی کەم هەیە لە قورئاندا باس لە حوکم بکات و ئەو دەقانەش لە شێوەی پێشنیازدایە، هەندێك لە زانایان لەسەرو ویست و ئارەزووی خۆیان یان بۆ بەرژەوەندی ئیسلامییەکان تەفسیری دەقەکان دەکەن بە جۆرێك کە مەبەست پێی حوکم و سیستەمی سیاسی بێت، ئەو دەقانەش لە قورئان کە هاتووەتە خوارەوە بۆ ئەوکاتەو بۆ چارەسەری کێشەی نێو خێڵەکانی عەرەب بووە نەك وەك دەستوورو یاسایەك بێت بۆ ژیان و بەرێوەبردنی دەسەڵاتێك.

سەرەتا ئەوەی ئەم تێڕوانین و بۆچونانەیان هەیە ئاشکرایە کە تێگەشتن و زانیاری زۆر لاوازە بۆ قورئان و فەرمودەکانی پێغەمبەر ﷺ و چۆنییەتی تەفسیرو ڕاڤەی دەقەکان و هۆکارەکانی هاتنەخوارەوەی ئەو دەقانە، چونکە تەنها لە قورئاندا (91) جار وشەی (الحكم، يحكم، حكمتم، يحكمون، يحكموك، احكم، تحكمون، حكما، حكمة، الحكام، حكما) هاتووە، وە هیچ موفەسیرێك نەهاتووە هەموو ئەو ئایەتانەی ئەم وشانەی تێدایە بە ویستی خۆیان ڕاڤەی بکەن و بە جۆرێك تەفسیری بکەن کە گوایە باس لە سیستەمی ئیسلامیی و یاسای سیاسی ئیسلام دەکات ،بۆنموونە کە خوای گەورە دەفەرمویت: (وَآتَيْنَاهُ الْحُكْمَ صَبِيّاً) مريم: (12)، واتە: (تێگەیشتنی تەورات و ژیری و حیکمەتمان پێ بەخشی)، ئەم ئایەتە باس لە پێغەمبەر عیسا (عليه السلام) دەکات و هەر لەبەر ئەوەی وشەی حوکمی تێدایە هیچ یەکێك لە زانایان و موفەسیرەکان پەنایان نەبردوەتە ئەو جۆرە چەواشەکارییە، چونکە هەموو زانایانی تەفسیر دەزانن چەواشەکاری لە قورئاندا هەڕەشەی گەورەی لەسەرە، (وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ افْتَرَى عَلَى اللّهِ كَذِباً) (الانعام: 21)، واتە: (کێ ستەمکارترە لەو کەسەی درۆ هەڵبەستێ بەدەم خواوە)، هەروەها پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت (من كذب عليَ متعمدا فليَتبوا مقعده من النار)، واتە: (هەرکەسێك بە دەستی ئەنقەست درۆ بەدەم منەوە بکات شوێنی خۆی دیاری بکات لە دۆزەخدا)، لە ئایەتێکی تردا خوای گەورە وشەی (حکم)ی هێناوە بەڵام نەك بە مانای (حوکم) بەڵکو بە مانای قەزاوقەدەر دێت، وەك لە ئایەتی ((فَاصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ وَلَا تُطِعْ مِنْهُمْ آثِماً أَوْ كَفُوراً) (الإنسان: 24)، واتە: (چاوەڕوانی قەزاوقەدەرو بڕیاری خوا بکەو، فەرمانبەرداری هیچ گوناهبارو بێباوەڕێك مەکە).

هەندێك جار وشەی (حكم) کە هاتوو لە دەقەکانی قورئاندا، مەرج نییە بە مانای حوکمڕانیی و دەسەڵات و سیستەمی سیاسیی بێت و لە هەردەقێکدا مانای تایبەتی خۆی هەیە، ئەویش بەپێی بنەماکانی زمان و تەفسیرو لێکدانەوە کە زانایان لەسەری کۆکن بۆ تەفسیرکردن، بۆ نموونە: (سورەتی الحج: 56، النساء 141، الشعرۀ 83 و ...هتد، ئەم ئایەتانەو چەند ئایەتێکی تریش هەن کە ووشەی (حکم)و هاوشێوەکانی تێدایە بەمانای دەسەڵاتی سیاسیی لێك نادرێتەوە، کەس ناتوانێت لە خۆیەوە هەستێت بە لێکدانەوەی ئایەتەکان بە ویست و نیازی خۆی، چونکە یەکسەر ناڕێکیی و نادروستی لێکدانەوەکەی دەردەکەوێت، بەڵام زۆر لە ئایەتەکان کە لە قورئاندا کە وشەی (حکم)، یان هاوشێوەکانی تێدایە بە مانای دەسەڵات و (حوکم)و سیستەمی سیاسی هاتووە، بۆنموونە:

. (وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللّهُ فَأُوْلَـئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ) (المائدة: 44)، واتە: (ئەوەی حوكم نەكات بەوەی كە خوا ناردویەتیە خوارەوە بۆ سەر محمد بەدەست ئەنقەستو لەكاتی توانا و دەسەڵاتدا ئەوكەسە لە سنوری ئیسلام دەرچووەو لە بێباوەڕان دادەنریت).

. یان لە ئایەتێكی تردا خوای گەورە دەفەرموێت: (إِنِ الْحُكْمُ إِلاَّ لِلّه)، (یوسف: 40)، واتە: (دوا بڕیارو دەسەڵات دەگەڕێتەوە بۆ لای خوا)، مەرجیش نییە تەنها بە وشەی (حكم) بوونی سیستەمی سیاسی دەركەوێت، چونكە لە قورئاندا بە چەندین جۆر ئەم مەسەلە دوویات دەبێتەوە، بۆنموونە (أَلاَ لَهُ الْخَلْقُ وَالأَمْرُ) (الاعراف: 54)، واتە: (دروستكردنو فەرمانڕەوایەتی تەنها شایستەی خوایەو ئەو خاوەنییەتی)، لە چەندین ئایەتی تردا ئەم مەسەلەیە بە چەند جۆرە وشەو شێوازێكی جیا دوویات كراوەتەوە، وەك نموونەی ئایەتەكانی (الشوری 10، الجاثیة 18، النسا 58، المائدة 50 و..هتد) هەروەها لە زۆر ئایەتی تردا بە وشەو زاراوەیتر بوونی دەسەڵاتی سیاسیی سەلمێنراوە، چونكە وەك زانراوە دەسەڵات تەنها لە یەك كەسدا یان لە یەك دامەزراوەو دەزگادا كۆنابێتەوە.

بۆ نموونە: (وَشَاوِرْهُمْ فِي الأَمْرِ) یاسای ڕاوێژو پرسو ڕا ڕووندەكاتەوە كە بریتیە لە كاری دەسەڵاتی تەشریعی.

. (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ أَطِيعُواْ اللّهَ وَأَطِيعُواْ الرَّسُولَ وَأُوْلِي الأَمْرِ مِنكُمْ) (النساء: 59)، واتە: (ئەی ئەوكەسانەی بڕواتان هێناوە گوێڕایەڵی خواو گوێڕایەڵی پێغەمبەر بكەن پاشانیش گوێڕایەڵی كاربەدەستە عادیلەكانی خۆتان بكەن)، كە یەكێك لەسیستەمەكانی پەیوەندی نێوان سەرۆكو جەماوەر دەستنیشان دەكات.

. (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَأْكُلُواْ الرِّبَا أَضْعَافاً مُّضَاعَفَةً) (ال عمران: 130)، واتە: (ئەی ئەو كەسانەی بڕواتان هێناوە سوو مەخۆن بە چەند بەرانبەر)، كە یەكێك لە بنەماكانی یاسای بازرگانیو ئابووری دەستنیشان دەكات.

. (لاَّ جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِن طَلَّقْتُمُ النِّسَاء مَا لَمْ تَمَسُّوهُنُّ أَوْ تَفْرِضُواْ لَهُنَّ فَرِيضَةً) (البقرة: 236)، واتە: (گوناهتان ناگات گەر ژنانێك تەلاق بدەن كە هێشتا نەچوبنە لایان یان مارەییتان بۆ دانەنابن)، كە یەكێك لە بنەماكانی یاسای باری كەسیەتی دەستنیشان دەكات.

. (وَالَّذِينَ يَرْمُونَ الْمُحْصَنَاتِ ثُمَّ لَمْ يَأْتُوا بِأَرْبَعَةِ شُهَدَاء فَاجْلِدُوهُمْ ثَمَانِينَ جَلْدَةً وَلَا تَقْبَلُوا لَهُمْ شَهَادَةً أَبَدا) (النور: 4)، واتە: (ئەوانەی بوختانی زینا دەكەن بۆ ئافرەتانی داوێن پاك لە پاشان چوار شاهید ناهێنن لەسەر ڕاستی قسەكەیان سزای ئەوانە هەشتا دارە، هەرگیز شاهیدیان لێوەرمەگرن، كە یەكێكە لە بنەماكانی یاسای سزاو تاوان).

جگە لەم دەقانە بە سەدان دەقی تر هەن كە بەڕاستەخۆ باس لە دەسەڵاتی سیاسیو یاسا جۆربەجۆرەكانی دەكات، هەروەها جگە لە دەقەكانی قورئان چەندین دەقی تر هەیە لە سوننەت كە بە شێوەیەكی ڕوونو ئاشكرا ئاماژە دەكات بە بوونی سیستەمی سیاسی ئیسلامیو بنەماو یاسا جیاجیاكانی دەستنیشان دەكات بۆ نموونە:

. (من امركم من الولاة بمعصية فلا تطيعوه) الباني ج5- ژ2324)، واتە: (هەركەس فەرمانی پێ كردن لە سەركردەكانتان بە كارێك كە بێگوێی خوایی تێدابێت بە گوێی مەكەن)، ئەم فەرمودەیە سنووری پەیوەندییەكانی نێوان هاووڵاتیانو دەسەڵات دەستنیشان دەكات.

. (ما من امام يغلق بابه دون ذوي الحاجة و الخلة و المسكنة الا اغلق الله ابواب السماء دون خلته وحاجته ومسكنته)الباني -ج2 ژ629)، واتە: (هەر پێشەواو سەركردەیەك دەرگای داخست لە ڕووی خاوەن پێویستی و هەژاران و نەدارانی گەلەكەیدا خوای تاكو تەنها دەرگای ئاسمانەكانی لێ دادەخات لە ڕووی هەژاریو نەداری پێویستی و داخوازییەكانیدا).

ئەم فەرمودەیە یەكێك لە ئەركو كاری دەسەڵاتداران دیاری دەكات بەرانبەر هاووڵاتیان.

. (من استودع وديعة فلا ضمان عليه -الباني ج5 ژ-2315)، واتە: (هەر كەس ماڵێكی كردە ئەمانەت بەسەر كەسێكەوە زەمانەت ناكەوێتە سەری)، كەیەكێك لە بنەماكانی یاسای مەدەنی دەست نیشان دەكات

. (انما يزرع ثلاثة: رجل له ارض فهو يزرعها، ورجل منح ارضا فهو يزرع مامنح، ورجل استكرى ارضا بذهب او فضة) ألبانى – ج4– ز–1715–)، واتە: (سێ كەس مافی كشتوكاڵی هەیە، كەسێك زەوی خۆی بێتو بیكاتە كشتوكاڵ، وە كەسێكیش زەویەكی پێ بەخشرابێتو ئەوەی پێی بەخشراوە بیكاتە كشتوكاڵ، یان كەسێك زەویەكی بە كرێ گرتبێت بە زیو یان ئاڵتون بۆ ئەوەی بیكاتە گشتوكاڵ) كە یەكێك لە سیستەمەكانی موڵكایەتیو كشتوكاڵ دەستنیشان دەكات.

. (ان الناس اذا راو االظالم فلم ياخذوا بيده او شك ان يعمهم الله بعقاب منه) البانى –ج5–ژ–1564) واتە: (گەر خەڵكی ستەمكار یان دی بەردەوامە لە ستەم كردنو دەستیان نەگرتو بەرگرییان نەكرد لە ستەم كردنی نزیكە كە خوای گەورە سزایەكیان بۆ دابەزێنێت گشتگیربێت و هەموویان بگرێتەوە)، كە یەكێك لە بنەماو یاساكانی كاری ئۆپۆزسیۆن دەستنیشان دەكات.

ئەم بەڵگانەی ئاماژەیان پێكراوەو چەندانی تریش هەن، وەلأمێكی ڕاستەوخۆیە بۆ ئەو كەسانەی گومانیان وایە كە ئەو دەقانەی لە قورئان یان سوننەت باس لە سیستەمی حوكمو دەسەلأت دەكەن چەند دەقێكی كەمن، دیارە ئەو كەسانەش یان شارەزاییان لە قورئاندا نییە یان هەر دەیانەوێت چەواشەكاریو پەردەپۆشی بكەنو خەڵك فریو بدەن، چونكە گەر سەرنجی زۆریك لە یاساكانی باری كەسێتیو سزاو تاوانو یاسای بازرگانیو یاسای مەدەنی بدرێت لە زۆربەی ولأتانی ئیسلامیدا كە یەكێكیان عێراقە زۆرێك لە یاساكانیان لە بنەماو یاساكانی ئیسلام وەرگیراوەو ئەو یاساو بنەمایانەش لە پەڕاوە فیقهیەكانو نووسینی زانایانو سەرچاوە گرنگەكانی تری ئیسلام وەرگیراوەو كراوەتە یاساو كاری پێدەكرێت.

یان ئەوكەسانەی دەڵێن ئەو دەقانە لە شێوەی پێشنیازدان ئەمەش سەرچاوەی گرتووە لە نەزانینو بێئاگایی لە قورئانو سوننەتو زانستە ئیسلامییەكان، چونكە وەك زانایانی ئوصوڵی فیقهی ئیسلامی لە بنەماكانی ئەو زانستەدا ڕونیان كردووەتەوە كە ئەو دەقانەی باس لە دەسەلأتو حوكمرانیو جێبەجێ كردنی ئەحكامەكان دەكەن لەسەر خەڵك لەسەر شێوەی پێشنیاز نین، بەڵكو فەرمانێكی خواییەو دەبێت جێبەجێ بكرێت، لەسەر جێبەجێكردنیشی پاداشت وەردەگیرێتو كەمتەرخەمی نواندن لە جێبەجێكردندا بە تاوانكردن دادەنرێتو سزای لەسەرە بەڵگەشمان بۆ ئەم ڕاستییە:

حوكمی تەكلیفی پێنج جۆرە: (ایجاب، ندب، تحریم، كراهە، اباحە).

زۆر بە درێژی ناڕۆینە ناو بابەتەكانی زانستی ئوصوڵی فیقه تەنها ئەوەندە كە پەیوەستە بە بابەتەكەمانەوە (ئیجاب): واتە: ئەو داخوازییەی كە لەلایەن شاریعەوە كراوە لە شێوەی حەتمو ئیلزامدایە و حوكمی فیقهی ئەو داخوازییە دەبێتە (وجوب)، سیفەتی كارەكەش دەبێتە (واجب) مەبەست لەم بنەمایە ئەوەیە ئەو داخوازییەی كراوە لە هەر دەقێكدا بێتو لە شێوەی فەرمانو ئیلزامدا بێت دەبێت جێبەجێ بكرێت بە جۆرێك بكەری ئەو داخوازییە شیاوی پاداشتو ڕێزلێنانەو كەمتەرخەمی كردنیش بەرانبەر بەو داخوازییە شیاوی سزاو لۆمەكردنە، وازلێهینانی تاوانێكی سلبییە، چونكە وازهێنانو نەكردنی واجبێكە، زانایان بنەمایەكی ڕوونیان بۆ ئەمە داناوە (الامر يدل على الوجوب) واتە: فەرمانكردن لە دەقەكاندا بەڵگەیە لەسەر واجیب بوون، بۆنموونە كە خوای گەورە دەفەرمووێت: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ أَوْفُواْ بِالْعُقُودِ) (المائدة: 1)، واتە: (ئەی بڕواداران گرێبەستەكانتان جێبەجێ بكەنو وەفاتان هەبێت بە بەڵێنەكانتانەوە)، كە یەكێكە لە سیستەمەكانی یاسای مەدەنیو فەرمان دەكات بە پابەندبوون بەگرێبەستەكانەوە بە شێوەیەكی گشتی، یان دەفەرمووێت: (وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا اسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ وَمِن رِّبَاطِ الْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِ عَدْوَّ اللّهِ وَعَدُوَّكُمْ) (الانفال:60)، واتە: (ئەی بڕواداران ئامادە بكەن بۆیان ئەوەی لە تواناتاندا هەیە لە هێزو لە ئە سپێ دابەستراو تا بترسێنن پێی دوژمنی خواو دوژمنی خۆتان)، كە یەكێكە لە سیستەمەكانی سیاسی دەوڵەت كە داوادەكات بەبوونو ئامادەكردنی هێز بۆ پاراستنی قەوارەی دەوڵەتو بەرقەراركردنی ئاشتیو ئاسایش، لێرەدا دەبینین هەردوو زاراوە قورئانیەكە لە شێوەی داخوازیی فەرماندایە (اوفوا، اعدوا)، كەواتە: دەبێت ئەو فەرمانە جێبەجێ بكرێتو نەكردنیشی تاوانبارییەو سزای لەسەر دەبێت. نموونەیەكی تر لەسەر داخوازی لە دەقەكانی قورئاندا: (وَأَنِ احْكُم بَيْنَهُم بِمَا أَنزَلَ اللّهُ) (المائدة: 49)، واتە: (فەرمانمان پێكردی كە حوكم بكەیت لە نێوانیان بەوەی كە خوا ناردوویەتییە خوارەوە).

(تحريم): بريتییە لەو ڕێگری وقەدەغەکردنەی کە لە لایەن شاریعەوە کراوەو لەسەر شێوەی حەتمو ئیلزامە بە نەکردنو وازهێنان، وەحوکمی فیقهی ئەو کارە دەبێتە (محرم)، واتە حەرام کراوو قەدەغەکراوو،وە سیفەتی کارەکەش دەبێتە (حرام) مەبەست لەم بنەمایە ئەوەیە کە هەردەقێك زاراوەی ڕێگریو قەدەغەکردنی تێدابێت لە شێوەی حەتمو ئیلزام نابێت کەس لێی نزیك ببێتەوەو ئەنجام بدرێت، وە کردنی دەبێتە تاوانو سزای لەسەرەو نەکردنو وازهێنانی دەبێتە هۆی پاداشتو ڕێز لێنان بۆ خاوەنەکەی، زانایان بنەمایەکی ڕوونیان لەسەر ئەم ڕێسایە داناوە (النهي يدل على التحريم) هەر زاراوەیەك لەسەر شێوازی قەدەغەکردنو ڕێگری کردن بوو بە وازهێنان بەڵگەیە لەسەر حەرامبوون، بۆنموونە (وَلاَ تَقْتُلُواْ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللّهُ إِلاَّ بِالحَقِّ) (الاسراء: 33)، واتە: (کەسێك مەکوژن کە خوا کوشتنی حەرام کردووە مەگەر بە هۆیەکی ڕاستو ڕەوا)، کە یەکێکە لە یاساکانی سزاو تاوان سەبارەت بە کوشتن (وَلاَ تَأْكُلُواْ أَمْوَالَكُم بَيْنَكُم بِالْبَاطِلِ) (البقرة: 188)، واتە: (ماڵی یەکتر مەخۆن لە نێو خۆتاندا بە ناڕەوا) کە یەکێکە لە ڕێساکانی سیستەمی ئابووری ئیسلامی، لێرەدا دەبینین وشەکانی (ولاتقتلوا، ولاتاكلوا) لەسەر شێوەی قەدەغەکردنو ڕێگری کردنە،وە لەسەر شێوازی ئیلزام کردن هاتووە نەك پێشنیاز، بە جۆرێك کردنی ئەو کارانە خاوەنەکەی تووشی سزادەکاتو نزیك نەبوونەوەش لەو کارانە خاوەنەکەی پاداشت وەردەگرێت، جگە لەوەش مەرج نییە واجیب بوون هەر لەسەر شێوەی فەرماندان بێتو حەرامیش لەسەر شێوەی قەدەغەکردن بێت چەندین شێوەی تر لە دەقەکانی قورئاندا بەدی دەکەین بۆ نموونە (حُرِّمَتْ عَلَيْكُمْ أُمَّهَاتُكُمْ وَبَنَاتُكُمْ) (النساء: 23)، واتە: (حەرام کراوە لە سەرتان مارەکردنی دایکانتانو کچانتان) کە یەکێکە لەسیستەمەکانی یاسای کەسیەتی بە وشەی ڕاستەوخۆی (حرمت) ئەو دەقە ئاڕاستەی خەڵك کراوە وقەدەغەکردنی ڕاگەیەنراوە یان (كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِصَاصُ فِي الْقَتْلَى) (البقرة: 178)، واتە: (پێویستکراوە لەسەرتان تۆڵەسەندن لە کوژراوەکانتان بە یەکسانی) کە باس لە سیستەمی سزا دەکات بە زاراوەی (کتب) ئاڕاستەی فەرزبوونی سزا دەکات بۆ تاوانی کوشتن، هەروەها بە چەندین شێوازو جۆری تر دەقەکانی قورئانو سوننەت فەرمانکردنو قەدەغەکردن دەستنیشان دەکات لە مەسەلەکانی دەسەڵاتو سیستەمی ئیسلامی، ئەو کەسەی دەیەوێت زیاتر لەم مەسەلەیە شارەزا ببێت دەتوانێت بە خوێندنەوەی زانستی ئوصوڵی فیقه بگات بەو مەبەستە.

لەگەڵ ئەمانەشدا دەقەکانی قورئان یان سوننەت خالیٚ نین لەسەر هاندانو ڕێنماییکردنو پێشنیاز لەسەر هەندێك کاری چاکەو خێرکردن بەرانبەر بە خەڵكو نیشتمانو کاری گشتیو تایبەتی، مەبەستیش لەوەدا بۆ ئەوەی مرۆڤەکان کۆت نەکرێن بە کۆمەڵە دەقێکی فەرماندانو قەدەغەکردن، ئەمەش بۆ ئەوەیە مرۆڤەکان ئازادبن لە هەندێك بواردا کە ویستو ئارەزوی خۆیان بخەنە کارو سەربەست بن لەو چوارچێوەیەداو ئەوەش یەکێکە لە سیفەتە گرنگەکانی قورئانو سوننەت کە هەموو شتێك لە سنوری واجیبو حەرامدا نییە، بەڵکو سنورێکی هێشتووەتەوە کە مرۆڤەکان تێدا ئازاد بنو گەر کەسێك بیەوێت کاری چاکەو چاکەخوازی بکات بواری بۆ دانراوەو پاداشتیش وەردەگرێتو ئەو کەسەش نەیکات تاوانبار نابێت، بەڵام پلەی ئەو کەسانە هاوشێوە نین لە ڕۆژی دواییدا، ئەو دەقانەش زۆرن کە لە شێوەی فەرمانکردندایە بۆ جێبەجیٚ کردنی سیستەمی ئیسلامیو چەسپاندنی یاسا جۆربەجۆرەکانی، هەروەها دەقەکانی قەدەغەکردن زۆرن کە ئاڕاستەی مرۆڤەکان کراوە کە نابێت نزیك هیچ یاساو بەرنامەیەك بکەون کە ناکۆك بێت لەگەڵ ئیسلامداو نەگونجێت لەگەڵ بنەماکانی قورئانو شەریعەتدا وەك لە قورئاندا هاتووە: (وَأَنِ احْكُم بَيْنَهُم بِمَا أَنزَلَ اللّهُ وَلاَ تَتَّبِعْ أَهْوَاءهُمْ وَاحْذَرْهُمْ أَن يَفْتِنُوكَ عَن بَعْضِ مَا أَنزَلَ اللّهُ إِلَيْكَ) (المائدة: 49)، واتە: (فەرمانمان پێکردی کە حوکم بکەیت لە نێوانیاندا بەوەی کە خوا ناردوویەتییە خوارەوەو شوێن حەزو ئارەزوویان نەکەوێت، وریابە لێیان لەوەی بتترازێنن لە هەندێك لەوەی کە خوا ناردوویەتییە خوارەوە بۆت).

وەئەوەی لەم بابەتەدا پێویستە ئاماژەی پێبکەین ئەوەیە هەندێك نووسەر دەیانەوێت گومانو دودڵی دروست بکەن لەسەر دەقەکانی قورئانو سوننەتەکانی پێغەمبەر ﷺ لە بواری سیستەمی سیاسیو ئیسلامیدا، بەو پاساوەی گوایە ئەو دەقانەی قورئانو هۆی دابەزینی لە لایەن خواوە یان هەڵوێستو وتەکانی پێغەمبەر بۆ چارەسەرکردنی ڕوداوێکی کتوپڕی

ئەو كاتە بووەو بۆ ڕێکخستنی هەندێك ناكۆكی كە لە نێو كۆمەڵگای عەرەبی ئەوكاتەدا سەریهەڵداوە، بۆ نموونە ئایەتەكانی (44 ـ 47)ی سورەتی (المائدة) كە دەفەرمویێت: (لاَ يَسْتَأْذِنُكَ الَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِاللّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ أَن يُجَاهِدُواْ بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ وَاللّهُ عَلِيمٌ بِالْمُتَّقِينَ* إِنَّمَا يَسْتَأْذِنُكَ الَّذِينَ لاَ يُؤْمِنُونَ بِاللّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ وَارْتَابَتْ قُلُوبُهُمْ فَهُمْ فِي رَيْبِهِمْ يَتَرَدَّدُونَ* وَلَوْ أَرَادُواْ الْخُرُوجَ لأَعَدُّواْ لَهُ عُدَّةً وَلَـكِن كَرِهَ اللّهُ انبِعَاثَهُمْ فَثَبَّطَهُمْ وَقِيلَ اقْعُدُواْ مَعَ الْقَاعِدِينَ* لَوْ خَرَجُواْ فِيكُم مَّا زَادُوكُمْ إِلاَّ خَبَالاً ولأَوْضَعُواْ خِلاَلَكُمْ يَبْغُونَكُمُ الْفِتْنَةَ وَفِيكُمْ سَمَّاعُونَ لَهُمْ وَاللّهُ عَلِيمٌ بِالظَّالِمِينَ)، كە لەسەر كێشەی چەند جوولەكەیەك هاتووەتە خوارەوەو بۆئەوە نییە كە ببێتە سیستەمی سیاسی، هەندێك لەو نووسەرانەش ئیسلامییەكان بەوە تاوانبار دەكەن گوایە لە زۆربەی نووسینەكانیاندا هۆكاری هاتنەخوارەوەی ئایەتەكان نانووسن و ئاماژەی پێناكەن.

دیارە ئەو كەسانەی ئەمجۆرە ڕاو بۆچوونانەیان هەیە شارەزاییان لە قورئان و سوننەت و یاساكانیدا كەمە، چونكە وەك زانراوە زانایانی یاسا لە كاتێكدا دەیانەوێت تەفسیریان مانای دەقێكی یاسایی بكەن، جا دەقەكە قورئان بێت یان سوننەت یان دەقێك بێت دەسەڵاتی تەشریعی دایناببێت، یەكێك لەو هۆكارانەی پەنای بۆ دەبەن بۆ گەشتن بە مەبەست و تەفسیری دەقەكە بریتییە لە (الأسباب الموجبة) واتە پاڵنەر وهۆكاری هاتنەكاییەی ئەو یاسایە، وە هەروەها فوقەهاكان و زانایانی یاسا لەكاتێكدا ناڕێكییەك یان تێنەگەشتن یان دژ بەیەك بوونێك هەست پێ بكەن لە نێو دەقە یاساییەكان بۆ ئەوەی لە مەبەستی موشەریع (داڕێژەری یاسا) بگەن، پەنا دەبەنە بەر هۆكاری داڕشتنی ئەو یاساییە لەوكاتەدا، لێرەدا ئێمە دەپرسین: بۆچی پەنابرنە بەر (الأسباب الموجبة) بۆ یاسا دانراوەكان لەلایەن مرۆڤەوە ناكرێت بووترێت كە ئەو یاسایە بۆ ماوەیەكی كاتی و ڕووداوێكی كتوپڕ دانراوە؟!، چونكە بەڵگە نەویستە هەموو یاسایەك هۆكارێك یان پاڵنەرێك هەیە بۆ داڕشتنی و زۆرجاریش ئەو پاڵنەرە ڕووداوێك یان كێشەیەك یان بارودۆخێك فەرزی دەكات، لە ئەنجامی ئەو ڕووداوە داخوازییەك دروست دەبێت و كەلێنێك هەست پێدەكرێت لەبەر ئەوە دەسەڵاتی تەشریعی هەڵدەستێت بە دانانی دەق و یاسایك، بەڵێ ئەو كێشەی پێ چارەسەر دەكرێت لەو كاتەدا بەڵام سیفەتی بەردەوامیشی هەیە بۆ هەر كێشەیەكی هاوشێوە، بە هەمان شێوە هۆكاری دابەزینی قورئان بۆ ئەوە نییە كە تەنها كێشەیەك چارەسەر بكات و كۆتایی پێ بێت، چونكە ئەو بۆچوونە تەواو پێچەوانەیە لەگەڵ هۆی هاتنەخوارەوەی قورئان و مەبەست لە ناردنی پێغەمبەر ﷺ و ئیلغاكردنی هەموو پەیامەكانی پێش خۆی (ثُمَّ جَعَلْنَاكَ عَلَى شَرِيعَةٍ مِّنَ الْأَمْرِ فَاتَّبِعْهَا) (الجاثية: 18)، واتە: (لە پاشاندا تۆمان خستە سەر شەریعەتێك لە بارەی ئایینەوە تۆ شوێنی بكەوە)، وەك (الواحدي) دەڵێت: "ناكرێت مانای قورئان بزانین و تەفسیری دەقەكانی بكەین بەبێ گەڕانەوە بۆ هۆكاری دابەزینی ئایەتەكان و ئەو چیرۆكەی كە لەوكاتەدا ڕوویداوەو بە هۆیەوە ئەو دەقە دابەزیوە"، گەر سەرنجیش بدەین زۆربەی موفەسیرەكان لەگەڵ تەفسیری ئایەتەكاندا ئاماژەیان كردووە بە هۆكاری ناردنەخوارەوەی ئایەتەكان و فوقەهاكانیش لە زۆربەی كاتەكاندا بۆ سەلماندنی دیدو بۆچوونەكانیان لە وەرگرتنی بنەماو ئەحكامە شەرعییەكان پەنا دەبەنە بەر هۆكاری هاتنەخوارەوەی ئایەتەكان نەك بیشارنەوەو پەردەپۆشی بكەن. كەواتە هۆی هاتنەخوارەوەی ئایەتەكان یان بوونی ڕووداویك بۆ دەقێكی فەرمودەی پێغەمبەر ﷺ بریتییە لە (الأسباب الموجبة)ی ئەو دەقەو بۆ تێگەیشتن لە مەبەست و ناوەڕۆكی دەقەشەرعییەكان، دەبێت بگەڕێینەوە بۆ هۆكارەكانی هاتنە خوارەوەی ئەو دەقانە تا لە مەبەست و مانای دەقەكان بگەین، هۆی هاتنەخوارەوەی ئایەتێك یان وتنی فەرموودەیەك تەنها بۆ ئەو ڕووداوەی ئەو كاتە نەبووەو سنوری چەسپاندنیشی كۆتایی پێ نەهاتووە، بەڵكو ئەو ڕووداوە پاڵنەربووە بۆ داڕشتنی ئەو دەقەو چەسپاندنیشی فەرزكراوە بەسەر هەر كێشەیەكی هاوشێوەی تر كە لە داهاتوودا ڕوودەدات. وەك خوای گەورە دەفەرمویێت (الْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الإِسْلاَمَ دِيناً) (المائده: 3). واتە: (ئەمڕۆ ئاینەكەتانم كامڵ و تەواو كرد بۆتان، وە چاكەو بەهرەی خۆمم ڕشتووە بە سەرتاندا، وە ڕازی بووم كە لەمەودوا ئیسلام ئاینتان بێت).

**چوارەم:**

دەسەڵات پەیداكردن لە لایەن ئیسلامەوە واتە: پەیدابوونی شەڕو ئاژاوەو خوێن ڕشتن و تیرۆرو ستەمی ئاینی، هەرچۆن كاتی خۆی مەسیحییەكان لە ئەوروپا دەسەڵاتیان بەدەست بووە، سیمای دەسەڵاتیان كوشتن و خوێنڕشتن و ستەمی

مەزهەبی وئاینی بووە، ئێستاش ئیسلام دەسەلاَت بگرێتە دەست هەمان سیمینار دووبارە دەبێتەوە، چونکە ئیسلام دەسەلاَتێکی دینی پێکدەهێنێت هەروەك مەسیحییەت لەسەر ئەو بنەمایە دەسەلاَتی دروستکردبوو.

خاوەن ئەم بیرو بۆچوونانە بۆچوونەکەیان بە بەڵگەی تر پشتڕاست دەکەنەوە ئەویش هەڵسووکەوتی گروپە توندڕەوەکانی ئێستایە لە جیهانی ئیسلامی.

سەرەتای کێشەی عەلمانییەکان لێرەوە دەست پێدەکات کە هەمیشە بەراوردی ئیسلام دەکەن بە ئاینی مەسیحییەت و ئەو سیناریۆیەی لە سەدەکانی پێشودا ڕوویداوە لە ئەوروپا هەمان وێنە دەکێشن بۆ ئیسلام کاتێك دەسەلاَت بگرێتە دەست، ئێمەش لێرەدا پێویستە ئاماژە بکەین بە چەند خاڵێك تا بیسەلمێنین ئەو بەراوردە لە شوێنی خۆیدا نییەو هەڵسەنگاندنێکی زانستی نییە:

1. دینی مەسیحییەت دەستکاری کراوە، لەو شێوازو شێوەیەی کە خوا ناردویەتییە خوارەوە وەك خۆی نەهێڵراوەتەوەو دیدو بۆچوونی مرۆڤەکانو بیروراو بۆچوونی زۆرێك لە قەشەکان کراوەتە قسەی خواو کراوەتە بڕیاری پەروەردگارو فەرزکراوە بەسەر هەڵگرانی دینی مەسیحییەت وەك خوای گەورە ئەم ڕاستییەمان بۆ ڕۆشن دەکاتەوەو دەفەرمویت: (يُحَرِّفُونَ الْكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِ وَنَسُواْ حَظّاً مِّمَّا ذُكِّرُواْ بِهِ) (المائدة: 13)، واتە: (وتەو فەرموودەی خوا لادەدەن لە شوێنەکانی خۆی، لە بیریان کرد بەشێکی زۆر لەوەی کە ئامۆژگاری کرابوون پێی)، زۆربوونی ئینجیلەکانو ناوهێنانیان بە ناوی یەکێك لە قەشەو پاپاکانەوە سەلماندنی ئەو ڕاستییەن کە ئینجیل وەك ئەو شێوە بنەڕەتییە نەماوەتەوە کە لە سەرەتاوە پێغەمبەر عیسا (عليه السلام) گەیاندویەتی بە شوێنکەوتووانی، بە تایبەت پاش بەرزکردنەوەی پێغەمبەر عیسا بۆ ئاسمان شێواندنو گۆڕین دەستی پێکرد.

بەڵگەش لەسەر ئەوە لە ساڵی 787 ز کاتێك دەسەلاَتی ئیسلامی گەشەی کردو بەرەو فراوانبوون دەڕۆشت، دەوڵەتی ڕۆما هەستا بە تێکەڵکردنی دینی مەسیحی بە بتپەرستی، ئەویش لە ڕێگەی ئەنجومەنی دووەمەوە کە لەو ساڵەدا بڕیاریاندا بە یەکگرتنی ئاینی مەسیحیو بتپەرستی، ڕۆما هەستا بە لادانی وەسیەتی دووەم لە ئینجیلدا کە ڕێگری دەکات لە پەرستنی پەیکەرو بت، لەو سەردەمەوە حوکمی پاپایی دەرکەوتو پاپا لەو کاتەدا ڕایگەیاند کە جێگری خوایەو بانگەشەی مەعصومیەتو بێگوناهی کردو خۆی فەرزکرد بەسەر کەنیسەو دەوڵەتدا، لە سەدەکانی ناوەڕاستدا کێشە دروست بوو لە نێوان کەنیسەو پاشاکاندا، ئەمەش وایکرد کە هەردوو دەسەلاَت جیابکەنەوە، بەلاَم لەژێر هەمان بیروبۆچووندا، ئەویش بە دابەشکردنی دەسەلاَت بۆ دوو جۆر (دەسەلاَتی دونیاییو دەسەلاَتی ڕۆحی)، وەك نووسەر (جان دی باری) لە کتێبی (السلطة الملكية والسلطة البابوية)دا ئاماژەی پێکردووە کە لە ساڵی 1302ز دا شێوازی حوکمو دەسەلاَت لە ئەوروپا وەرچەرخانێکی نوێی بەسەردا هات، ئەویش بەوەی قەشەکان ڕایانگەیاند کە خوا کەسێك هەڵدەبژێرێتو دیاری دەکات بۆ کاروباری دونیایی، ئەویش پاشاو حاکمەو کەسێکیش بۆ کاروباری ڕۆحیو کەنیسە بەڕێوەبردن کە ئەویش پاپایە، کەس بۆی نییە ململانێ بکاتو گوێڕایەڵ نەبێت، هەرکەس ملکەچ نەبێت بۆ ئیرادەی پاشاو پاپا ئەوە ململانێ لەگەڵ دەسەلاَتی خوادا دەکات، ئەمە نموونەی مشتێکە لە خەروارێك، لە دەستکاریو شێواندنی ئینجیل، لەبەر ئەوە هەمووئەو هەڵسوکەتو هەڵوێستو مومارەسانەی گەر بە ناوی دینی مەسیحییەتیشەوە کرابێت نابێت بکرێتە بەبەڵگە لەسەر دینی مەسیحییەتو ناتوانرێت بکرێتە بەڵگە بەسەر دینەکانی تر بە ڕەهایی، بەڵکو ویستو ڕای هەندێك قەشەو پاپاکان بووە نەك پابەندبوون بە دینی مەسیحییەتەوە.

2. دینی مەسیحییەت لە سروشتی خۆیدا بۆ قۆناغێکی دیاریکراو بووەوبە هەڵهاتنی پرشنگی ئیسلام ئەو قۆناغە کۆتایی هاتووە،هەڵگرانی ئەو دینە ستەمیان لە خۆشیانو لە خەڵکیش کردووە کە پابەند نەبوون بە ئیسلامەوەو وازیان لە مەسیحییەت نەهێناوە، چونکە پێچەوانەی ئاینو بەرنامەکەی خۆشیان ڕەفتاریان کردووە (يَا أَهْلَ الْكِتَابِ لِمَ تَلْبِسُونَ الْحَقَّ بِالْبَاطِلِ وَتَكْتُمُونَ الْحَقَّ وَأَنتُمْ تَعْلَمُون) (ال عمران: 71)، واتە: (ئەی خاوەن کتێبە ئاسمانییەکان بۆ پۆشاکی درۆ دەکەن بە بەر ڕاستیدا، ڕاستیەکە دەشارنەوە لەکاتێکدا خۆشتان ئەمە دەزانن).

**3. پرۆسەی سیاسی ئیسلامی بۆ دەسەڵات زۆر جیاوازە لە پرۆسەی دەسەڵاتی مەسیحی، چونكە لە لای ئاینی مەسیحی( پاش دەستكاری كردن‌و شێواندن)، حكومەت حكومەتی دینییە، قەشەو پاپاكانیان بانگەشەی ئەوە دەكەن كە ئەوان سێبەری خوان ، هەرشتێك ئەوان لە زەویدا حەڵاڵی دەكەن یان حەرامی دەكەن خوا لە ئاسماندا بڕیاری حەڵاڵی‌و حەرامی بۆ دەردەكات،قەشەكان بانگەشەی ئەوەیان كردووە كە ئەوان پەیوەستن بە خوا بە شێوەیەكی ڕاستەوخۆ، هەر بڕیارو ئاڕاستەو ڕێنماییەك كە ئەوان پێی هەڵدەستن قسەی خوایە، نابێت كەس پێچەوانەی گوفتاری ئەوان بجووڵێت‌و ململانێیان بكات، بەم شێوەیە هەموو ئازادی‌و سەربەستییە تاكی‌و تایبەتیان زەوت كردبوو، دین‌و ژیانی خەڵكیان كردوەتە موڵكی خۆیان، كەس بۆی نەبووە گفتوگۆو لێكۆڵینەوە بكات لە هەڵسووكەوتی كەنیسەو قەشەو پاپاكان، تەنانەت سنووری دەسەڵاتیان لەوەش زیاتر كرد بەوەی كە بە ویستی خۆیان بە هەشت‌و لێبوردنی خواییان دەبەخشییە هەندێك، دۆزەخ‌و نەفرینی خوایشیان دەگەیاندە هەندێكی تر، (صكوك الغفران)یان دابەش دەكرد، واتە: دەسەڵاتداری ڕۆژی دوایی‌و پاشە ڕۆژی خەڵكیشیان ڕاگەیاند، مەسیحییەكان مەفهومی دینیان گۆڕی سەبارەت بە دەسەڵات‌و حوكم ئەویش لە پێناو بەهێزكردنی پایەو دەسەڵاتی خۆیان، بەوەی كە خوا ئەوانی دەستنیشان كردووە كە دین‌و بەرنامەی خوا بچەسپێنن‌و بیكەنە دەستوورو یاسای گشتی،**

**پاپاكان دەسەلاتییان لەجەماوەر وەرگرتەوە بەوەی كە خوا حاكم دیاری دەكات‌و ئەو سەرۆكەی دەستنیشان كراوە هەڵبژێراوی خوایەو كەس ناتوانێت دەست بخاتە كاروباریەوە،سەرۆك دەسەڵاتی ڕەهای هەیە بەسەر هەموو كاروكردەوەی گەل‌و جەماوەردا، ئەمەش بە ڕاشكاوانە لە لایەن پاپا نیقولای یەكەمەوە ڕاگەیەنرا كە مەسیح كوڕی خوایە و ئەو كەنیسەی دامەزراندووەو (بطرس) كە هەڵبژێراوی خوایە كردویەتییە یەكەم سەرۆك، وە قەشەكانی ڕۆما حوكم‌و دەسەڵاتیان لەوەوە بە میراتی بۆ ماوەتەوە، بەشێوەی زنجیرەیەكی بەردەوام‌و پەیوەست بە خوا، لەبەر ئەوە پاپا نوێنەری خوایە لەسەر گۆی زەوی‌و دەسەڵات‌و سەروەری ڕەهای هەیە بەسەر هەموو مەسیحییەكانی سەر ڕووی زەوی بە دەسەڵاتدارو هاووڵاتیانەوە، كەنیسە لە ئەوروپادا خۆی بە سەرچاوەی یەكەمی كاروباری دینی‌و دونیایی دەزانی‌و كەس لە سەروی دەسەڵاتی كەنیسەوە نەبوو.**

**3. ئەو شەڕو شۆڕەو ئاژاوەیەی كە لەئەوروپا دروستبووە بە هۆی پابەندبوونیان نەبووە بە دینی مەسیحییەت، بەڵكو لادان‌و وازهێنانیان لە فەرمایشتەكانی پەروەردگار بەرەو ئەو ئاقارەی بردوون (وَلَوْ أَنَّهُمْ أَقَامُواْ التَّوْرَاةَ وَالإِنجِيلَ وَمَا أُنزِلَ إِلَيهِم مِّن رِبِّهِمْ لأكَلُواْ مِن فَوْقِهِمْ وَمِن تَحْتِ أَرْجُلِهِم) (المائدة: 66)، واتە: (بێگومان گەر خاوەن پەیامەكان كاریان بە تەورات‌و ئینجیل بكردایە وە ئەو قورئانەی كە هاتۆتە خوار لەلایەن پەروەردگاریانەوە بیچەسپێنن بێگومان ڕۆزییان دەخوارد لەلای سەرویانەوە ( ئاسمانەوە )و لە ژێر پێیانەوە– لە زەویەوە)، جگە لەمەش پاش دورخستنەوەی كەنیسەو قەشەكان لە دەسەڵاتی سیاسی‌و فەرمانڕەوایەتی گەلانی ئەوروپا لەپاش شۆڕشی فەرەنسی لە ساڵی 1789و شۆڕشی پیشەسازی بەریتانیا دەبوایە شەڕو شۆڕو ئاژاوە نەمایە لە ئەوروپا! هەموو ژیان‌و ژیاری ئەوروپای نوێ ئاشتی‌و برایەتی‌و خۆشەویستی بێت، بەڵام پێچەوانەكەی ڕاست‌ودرووستە، چونكە لەوكاتەی عەلمانییەت ونەتەوەییەكان هاتنە سەر حوكم لە ئەوروپاو قەشەو پاپاكان دورخرانەوە لە حوكم‌و دروشمی جیاكردنەوەی دین لە دەوڵەت پراكتیزە كرا، هەردوو جەنگی یەكەم‌و دووەمی جیهانی لەناو جەرگەی ئەوروپا هەڵگیرسا، كە ئامارەكان ئاماژە دەكەن بۆ كوژرانی (50) ملیۆن مرۆڤو (115) ملیۆن مرۆڤ كەمئەندام بووە، لە ژێر سایەی عەلمانییەت‌و جیاكردنەوەی دین‌و دەوڵەت، جگە لەوەش هەڵمەتە ئیستعمارییەكانی سەدەی نوێ بەسەركردایەتی بەریتانیاو فەرەنسا دەستی پێكرد بۆ سەر وڵاتە لاوازو بێهێزەكان لە كیشوەری ئاسیاو ئەفریقاو لەو هەڵمەتەشدا بە ملیۆنەها مرۆڤ بووەتە قوربانی لە پێناو بەرژەوەندی ئابووری‌و سیاسیی ئەو وڵاتانە. بەسەرژمێریش بێت ئەوهاووڵاتیانەی لەژێر دەسەڵاتی كەنیسەدا كوژراوە لەگەڵ ئەو كەسانەی لە پاش شۆڕشی ئازادی‌و پیشەسازی كوژراوە ئاسمان‌و ڕێسمان جیاوازییان هەیە.**

4. بەرنامەی دەسەڵاتی ئیسلامیی بنیات نانرێت لەسەر خوێنو ماڵی خەڵکی، چونکە ئیسلام پەیامێکی ئاشتیو برایەتییە خوای گەورە دەفەرموێت (وَاللّهُ يَدْعُو إِلَى دَارِ السَّلاَمِ) (يونس: 25)، واتە: (خوا خەڵك بانگ دەكات بۆ ماڵی ئاشتیو ئارامی)، پێغەمبەری خوا ﷺ دەوڵەتی ئیسلامی لە هەرێمی مەدینەدا پێکهێنا بەبێ زیان گەیاندن بە خەڵكی ئەو شارەو بەبێ خوێنڕژاندنو ستەم لە خەڵك كردن، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە كە دەوڵەت پێویستی بەهێز نییە یان هێز بەكار ناهێنێت، چونكە ئەوەش پێچەوانەی بوونی دەوڵەتو جێبەجێكردنی وەزیفەكانییەتی، لە كاتێكدا دەڵێین ئیسلام بەرنامەی ئاشتیو برایەتییە مەبەست دەستدرێژینەكردنو ستەم نەكردنە، بەڵام بەرگریكردن لەخۆو بڵاوكردنەوەی دادگەریو ئاسایش لە زۆربەی حاڵەتەكاندا پێویستی بە بەكارهێنانی هێز هەیە. نموونەیەك لەسەر ئەم ڕاستییە كاتێك صەلاحەددینی ئەییوبی شاری قودسی ڕزگار كرد لە ساڵی 583ی كۆچی زۆر بە دادگەرانە جووڵایەوە لەگەڵ گاورو جوولەكەكانی شاری قودسو ئازادیكردنو دەستی نەكرد بە كوشتارو خوێنڕشتن لەسەر بنەمای مەزهەبیو دینی ،بەڵام بە پێچەوانەوە كاتێك گاورەكان شاری قودسیان داگیر كرد (70) هەزار موسڵمانیان شەهید كرد ئەمەش مەسیحییەكانی ئەوكاتو ئێستاش دانی پێدا دەنێنو ئەو ڕاستییە دووپات دەكەنەوە.

به درێژایی حوكمی ئیسلامی كە سیازدە سەدەو نیووی خایاندووە كۆمەڵێك هەڵەو كەموكورتی هەبووە چ لە ئاست دەسەڵاتدا یان لە ئاست تاكو هاووڵاتیاندا بەلام لەبواری ستەمی دینیو مەزهەبیدا ئیسلام لە هەموو ئاینو ڕێبازەكانی تر بە گشتی دادگەرانەترو بە بەزەیی تر مامەڵەی كردووە لەگەڵ نەیارانو هەڵگرانی دیدو بۆچوونەكانی تر، گەر چەند نموونەیەك هەبێت لەو دیاردانە لە مێژووی ئیسلامیدا هۆكەی دەگەڕێتەوە بۆ لادانو ناڕەوایی كردن بەرانبەر بە ئیسلامو ڕەوشتی موسڵمان، ڕاستیەك هەیە پێویستە هەموو ڕۆشنبیرێك لێی بێدار بیت، ئەویش ئەوەیە گەر بەبەراووردكردنیش بێت ئەو خەڵكەی لەژێر دەسەڵاتی ئەو بیروڕایانەی كە بانگەشەی جیاكردنەوەی دینیان كردووە لە دەوڵەت كوژراون، لەگەڵ ئەو كەسانەی لە دەسەڵاتی ئیسلامیدا كوژراون هەرگیز شایستەی بەراوردكردن نین، گەر لە ڕابردوودا لە دەسەڵاتی ئیسلامی هەندێك هەڵوێستو هەڵسووكەوت هەبووبێت دەرئەنجامی لادانیان بووە لەبەرنامەی ئیسلامو دووركەوتنەوە بووە لە بنەما دیارو ئاشكراكان بۆ بەڕێوەبردنو فەرمانڕەوایەتی ئیسلامی، وەك شەڕی نێوان دەسەڵاتدارانو ویلایەتەكان یان كێشەی نێوان خەلیفەكانو كوڕەكانیان لەسەر دەسەڵات، لەم سەردەمەشدا بە ناوی ئیسلامەوە هەندێك هەڵوێستو كاری توندوتیژیو زیادەڕۆیی دەنوێنرێت هۆكەی دەگەڕێتەوە بۆ تێنەگەیشتنو نەزانینیان لە بنەماكانی فیكری ئیسلامیی، چونكە بنەماكانی ئیسلام لە ڕووی بانگەشەكردن بۆ هاوژینیو پێكەوەژیان دیارو ئاشكران وەك لە قورئاندا ئاماژەیان پێكراوە (يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوباً وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا) (الحجرات: 13)، واتە: (ئەی خەڵكینە بێگومان ئێمە دروستمان كردوون لە نێرو مێیەك وەكردومانن بە چەند گەلو هۆزەوە تا یەكتری بناسن)، هەروەها هەڵوێستی قورئان سەبارەت بە كوشتنو ستەم دەستنیشان كراوە. (مَن قَتَلَ نَفْساً بِغَيْرِ نَفْسٍ أَوْ فَسَادٍ فِي الأَرْضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ النَّاسَ جَمِيعاً) (المائدة: 32) واتە: (ئەوەی تەنیا كەسێك بكوژێت گەر لە تۆڵەی كەسێكی كوژراو نەبێت یان بە هۆی خراپەكاریو ئاژاوەنانەوە نەبووبێت ئەوە وەك ئەوە وایە هەموو خەڵكی كوشتبێ).

6. شەڕو پێكدادان سیمایەكی بەردەوامی شارستانیەتە یەك لەدوا یەكەكانی مێژوو بووەو پەیوەست نییە بە ئیسلامەوە، گەر بەراوردێكیش بكرێت شارستانی ئیسلامی كەمترین ڕێژەی بەردەكەوێت لە توندڕەوییو كوشتو كوشتار، بۆ نموونە، لە شەڕی مەزهەبی نێوان پرۆتستانتو ئەرسەدۆكس لە سەدەی سێزدەوە تا سەدەی حەڤدە نزیكەی (9) ملیۆن كەسیان لە یەكتر كوشتووە، لە مێژووی نوێداو لە ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمەریكا دا، سەدەی هەژدەو نۆزدە بە سەدەی دامەزراندنی ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمەریكا دادەنرێت، لەهەمان كاتدا بەسەدەی لەناوبردنو نەهێشتنی گەلانی بنەڕەتی كیشوەری ئەمەریكا ناودەبرێت، لە هێرشی 1776ز دا بۆ سەر هیندییە سوورەكانی (شیرۆكی) كە هاوپەیمانی بەریتانییەكان بوون هەموو شارەكانی هیندییەكان سووتێنران، هەموو بەروبوومە كشتوكاڵییەكانی ئەو ناوچانە

سووتێنران‌و لەناو بران، ئەوەی لە هیندییەکان مابوونەوە برانە دارستانەکان "بەپێی بڕیاری جۆرج واشنتن (28) شار بەتەوای وێران کرا لە کۆی (30) شار"، هیندییەکان نازناوی ڕوخێنەری شارەکانیان نابوو لە جۆرج واشنتن، یەکێکی تر لە پاڵەوانانی بنیاتنەری ولاتە یەککگرتووەکانی ئەمریکای ئێستا ناوی (جون شفنغوتن)ە کە یەکێك لە دروشمەکانی بریتیبوو لە (هیندییەکان بکوژن‌و پێستەکانیان داماڵن، منداڵ‌و گەورە مەبوێرن، کێچ لە کێچ دەبێت)، تائێستاش لە ئەمەریکا چەندین مەیدان‌و شۆستەو شوێنی گشتی بە ناوی ئەو پاڵەوانەوە ناونراوە تا سەروەریەکانی ون نەبێت، وەهەروەها یەکەم وڵات کە چەکی ئەتۆمی بەکارهێنا ئەمەریکا بوو لە 1945/8/6دا چەکی ئەتۆمی بەکارهێنا دژی شاری( هێرۆشیما)و بوویە هۆی کوشتنی (160) هەزار کەس، لەپاش سی ڕۆژ چەکی ئەتۆمیشی بەکارهێنا لەدژی شاری (ناکازاکی)و هەمان چارەنووس ڕووی کردە ئەو شارەش، لە شەڕی ڤیتنام . ئەمەریکادا زیاتر لە یەك ملیۆن ڤێتنامی کوشت کە زۆربەیان مەدەنی‌و هاووڵاتی بێ چەك بوون، لە ئەورووپادا پاش شۆڕشی فەرەنسی‌و شۆڕشی پیشەسازی بەریتانی ،هێرشی ئیستعماری دەستی پێکرد لە کاتێکدا دەسەڵاتی کەنیسە کۆتایی پێهاتبوو، سیستەمی سەرمایەداری‌و ئیشتراکی هاتبوونە مەیدان‌و عەلمانییەت لە چڵەپۆپەو سەرەتای سەرکەوتن‌و گەشەکردنی بوو، دروشمەکانی ئازادی‌و سەربەستی‌و ماڤ مرۆڤ تەشەنەی کردبوو، بەڵام لەو کاتەوە هێرشی داگیرکردن‌و دەست بەسەراگرتنی ولاتە لاوازو کەمتواناکان دەستی پێکردو زۆربەی ولاتانی جیهانیان خستە ژێر دەستی خۆیان بە زەبری چەك‌و داگیرکردن، وەك داگیرکردنی جەزائیرو مەغریب‌و مۆریتانیاو تونس‌و سوریا و لوبنان لەلایەن فەرەنساوە، داگیرکردنی عێراق‌و میسرو فەلەستین‌و ئوردن و هند و پاکستان‌و صوماڵ لە لایەن بەریتانیاوە، کە لەوکاتەدا ئەو دوو ولاتە پێشەنگی سیستەمی سەرمایەداری‌و دروشمەکانی جیاکردنەوەی دین‌و دەوڵەت‌و ئازادی تاك‌و بازاڕیان بەرزکردبوویەوە، بەڵام گەر سەرنج بدەین لە مێژووی کوشت‌و کوشتاری ئەو هێزانە بەرانبەر بەو گەلە هەژارو بێهێزانە دەسەلمێت کە بە دروشم ئاسۆیەکی نوێ بوون‌و هیوایەکیان دەبەخشییە گەلان، بەڵام لە کارو کردەوەدا هێزێکی داگیرکەرو دژ بە مرۆڤ‌و مرۆڤایەتی ڕەفتاریان نواندوەو تەنها کاریان بریتیبووە لە پەیداکردنی بازار بۆ پێشەسازییەکانی خۆیان‌و دزینی سەروەتی ئەو ولاتانە بۆ ئاوەدان کردنەوەی ولاتانی خۆیان‌و پەیداکردنی مادده خامەکان وەك سەرمایەی گرنگ‌و بە بەها بۆ خۆیان، دوو ملیۆن شەهیدی جەزائیر باشترین بەڵگەیە لەسەر ئەو ڕاستیانەی ئێمە دەیڵێین، گەر مێژووی سەرهەڵدانی شۆڕشە نوێیەکانی هەر کام لەو گەلانە هەڵبدەینەوە کە بەرانبەر ئەو هێزە داگیرکەرانە کردویانە هەست دەکەیت دڕندەیی‌و بێبەزەیی و کوشت‌و کوشتار سیما و پێناسەی ئەو ولاتە زلهیزانە بووە کە بەناوی ئازادی‌و دیموکراسی زۆربەی جیهانیان داگیرکرد، "وەك شۆڕشی ئاشتیانەی غاندی بەرانبەر بە بەریتانیا، شۆڕشی عەبدولکەریم خەتابی لە مەراکش بەرانبەر بە فەرەنسا، شۆڕشی گەلی میسری بەسەرکردایەتی ئەحمەد عورابی بەرانبەر بە ئینگلیزەکان‌و شۆڕشی شیخ مەحمود لە کوردستان بەرانبەر بە ئینگلیزەکان، ئەم شیوازە مامەڵەیە بەرانبەر بە ولاتانی دەرەوەی سنوری خۆیان کردوویانە، لە سەرەتای سەدەی بیستەم ناکۆکی کەوتە نێوان خودی دەوڵەتاکانی خۆیان‌و دوو جەنگی جیهانی گەورە سەرچاوەکەی لە ئەوروپا سەریهەڵدا کە بەلانەی ئازادی‌و ماڤ مرۆڤ دادەنرێت‌و لە هەردوو جەنگەکەدا زیاتر لە(50) ملێۆن کەس کوژراون‌و (115) ملیۆن هاووڵاتیانی ئەورووپا کەمئەندام بوون، سیستەمی ئیشتراکیش کەمتر نەبووە لە سیستەمە سەرمایەدارەکان لە ڕووی کوشتن‌و کوشتارو داگیرکردنەوە، پاش شۆڕشی ئۆکتۆبەر کە بەسەر قەیسەری ڕووسیادا کراو شۆڕشی سوور هاتە سەر حوکم دەستکرایە داگیرکردنی ولاتە دراوسێکان وەك ئەرمینیاو تاجیکستان‌و قیرغستان‌و ئازربایجان‌و شیشان‌و کازاخستان، لەسەر ئێسك‌و خوێن‌و سەرمایەی ئەو ولاتە داگیرکراوانە یەکێتیی سۆڤیەتی جاران بنیات نرا، بەهێزی ئاگرو ئاسن‌و داگیرکردن‌و کوشت‌و کوشتار ئەو گەلانە ملکەچ کران، وەك لە سەرچاوە مێژووییەکاندا ئامارەیان پێکراوە لە پێناو چەسپاندنی کۆمۆنیستی لەو ولاتانەدا نزیکەی (15) ملێۆن موسڵمان قەلاچۆ کراوون، شۆڕشەکانی دژی دەسەلاتی شیوعی بەڵگەی دیارو ئاشکرای ئەو ڕاستییەن، پاش ڕووخانی سۆڤیەت زۆربەی ئەو ولاتانە جودا بوونەوەو ئازادی‌و سەربەخۆیی خۆیان ڕاگەیاند، بە وردی ناڕۆینە ناو لاپەڕەکانی مێژووی کوشتن‌و کوشتارو پێشێلکردنی ماڤ مرۆڤ‌و ستەمکردنی هەردوو

بلۆکی سەرمایەداری‌و سۆسیالستیی، ئەوە نووسینێکی تایبەتی دەوێت، بەڵام ئەمە وەك نموونەیەك بۆ ئەوەی بزانرێت ئەو دەسەڵاتانە بە دروشم‌و گوفتار هیچیان نەهێشتوەتەوە، بەڵام مێژوو باشترین بەڵگەیە لەسەر ڕەفتارو هەڵوێست‌و هەڵسووکەوتیان بەرانبەر بە مرۆڤ بەبێ جیاوازی دین‌و نەژادو ڕەگەز، گرنگ تەنها دەستخستنی سەروەت‌و سامانە بۆ وڵاتی خۆیان، لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت کە هەڵوێستی دەسەڵاتی ئیسلامی سەبارەت بە پاراستنی گیانی مرۆڤ وڕێز لێ گرتنی بە هەڵەو کەمووکورتییەکانیشەوە هەرگیز بەراورد ناکرێن لەگەڵ ئەو کوشتارو برین‌و ئازارانەی لە لایەن وڵاتە زلهێزەکانەوە ئەنجامدراوە بەرانبەر وڵاتانی جیهانی سێیەم‌و بەرانبەر بە هاووڵاتیانی خۆیان .

7. لە دەسەڵاتی سیاسی ئیسلامیدا هاوڵاتیبوون بنەڕەت و بنەمایە بێ لێکدانەوەی ڕەگەزو ڕەنگ‌و زمان‌و دین، چونکە ئیسلام یەك ڕەگەزی بۆ مرۆڤایەتی دووپات کردووەتەوە، وەك پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (انتم بنو ادم وادم من تراب) ئەبو داود ڕوایەتی کردووە، واتە: (ئێوە نەوەی ئادەمن‌و ئادەمیش لە خۆڵ خولقێنراوە)و بەرنامەکانی ئیسلام سیما و بنەمایەکی جیهانی لە خۆی گرتووە کە دەتوانرێت بچەسپێنرێت بەسەر ئەو کە سانەی باوەڕیان بە ئیسلام هەیە وەك دین‌و ڕێباز یان ئەوانەی لە نیشتمانی ئیسلامیدا دەژین‌و هاووڵاتین لەو دەوڵەتەدا بادین‌و ڕێبازێکی تریشیان هەبێت، ئیسلام هەرگیز ستەمی ئاینی لە خۆ ناگرێت‌و هەمیشە ڕێگرە لە چەوسانەوەی ئاینی‌و دژایەتی جیبایی لەسەر بنەمای ئاینی دەکات، تەنها بنەماو پێوەر بریتییە لە هاووڵاتی بوون‌و پەیوەست بوون بە ئەرکەکانی هاووڵاتی بوونەوە، لە ڕووی یاساییەوە لە دەوڵەتی ئیسلامیدا هاووڵاتیانی دەسەڵاتی ئیسلامی موسڵمان بن یان ئاینێکی تریان هەبێت یەك ڕەگەزنامە هەڵدەگرن، ئەوانەی کە لە ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامیدان‌و هاووڵاتیانی ئەو دەسەڵاتەن با دینێکی تریان هەبێت بە یەکسانی سەیر دەکرێن، ئازادی تەواوی بیروباوەڕو مومارەسەی کاری سیاسی خۆیان هەیە، بۆ سەلماندنی ئەمەش ماوەردی کە یەکێکە لە زانایانی زانستی بەڕێوەبردن‌و سیاسەتی ئیسلامی وتوویەتی کە ئەوانەی موسڵمان نین‌و لە دەوڵەتی ئیسلامیدان بۆیان هەیەو بوار هەیە کە پۆستە تەنفیزییەکان وەربگرن‌و لە حکومەت بەشداربن چ وەك وەزیر یان فەرمانبەر یان هەر پۆستێکی تری وەزارەت، محمد حەمید دەڵێت: "ئەزموونی دەسەڵاتی ئیسلامی زۆریك لەو ناوانەی لەخۆ گرتووە کە موسڵمان نین‌و کاری دەوڵەتی ئیسلامیشیان لە ئەستۆ گرتووە ،بۆنمونە ئەو سەفیرەی کە پێغەمبەری خوا ﷺ دەستنیشانی کردووە وەك سەفیر لە حەبەشە کە ناوی (عەمری کوری ئومەییەی ضمری)بوو کە موسڵمانیش نەبوو، هەروەها کۆمەڵێك لە بێباوەڕانی دانابوو بۆ فێرکردنی نووسین‌و خوێندنەوە بۆ هاووڵاتیانی مەدینە کە لە جیاتی وەزارەتی پەروەردەن‌و خوێندنی ئێستایە، هەروەها پێغەمبەر ﷺ هەندێك لە بێباوەڕانی ڕاسپاردبوو بە کاری هەواڵگری بۆ بەرژەوەندی دەوڵەت کە ترسناکترین پۆستەو پەیوەستە بە ئاسایشی ئەو دەوڵەتەوە، لە سەردەمی عومەری کوڕی خەتابدا لە دیوانەکانیدا چەندین فەرمانبەری تێدا بووە کە دینێکی تریان هەبووەوە تەنانەت لە هەندێك سەردەم‌و کاتدا وەزیرو پۆستی گرنگیان وەرگرتووە"، تەنانەت ئەم دیاردەیە بووەتە جێگەی سەرسوڕمان‌و دەستخۆشی زۆریك لە ڕۆژهەڵات ناسانی ئەورووپی وەك (ئادەم میتز) دەڵێت: "لەو کارانەی سەرمان لێ سوڕدەمێنێت زۆری فەرمانبەرو کاربەدەستی ناموسڵمان بووە لە دەوڵەتی ئیسلامیدا".

سەبارەت بە دەسەڵاتی تەشریعی شیخ تەقییەدین نەبهانی دەڵێت: "مافی هەموو هاووڵاتیانی دەوڵەتی ئیسلامییە کە بەشداربن لە ئەنجومەنی تەشریعیدا پیاو یان ئافرەت موسڵمان‌و ناموسڵمان‌و مافیان هەیە خۆیان بپاڵێون بۆ ئەو پۆستانە".

سەبارەت بە ئازادی‌و سەربەستی ئەو هاووڵاتیانەی کە موسڵمان نین‌و لە سایەی دەوڵەتی ئیسلامیدا دەژین، ئەبو حەنیفەو ئەبو یوسف‌و محمدی کوڕی حەسەنی شەیبانی فەتوایان داوە، سنورەکان (الحدود) کە مافێکی ڕەهای خوایە نابێت بەسەریاندا جێبەجێ بکرێت، وەك سنوری زیناکردن یان عارەق خواردنەوە، هەروەها سەبارەت بە تۆڵەسەندنەوە، ئەبوحەنیفە ڕای وایە لە کاتێکدا موسڵمانێك زیممەیەك لە وڵاتی ئیسلامدا بکوژێت بە ناحەق دەبێت بکوژرێتەوە، لە بەرئەوەی خوای تاك‌و تەنها بەڕەهایی دەقەکەی هێناوە (وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَا أَنَّ النَّفْسَ بِالنَّفْس) (المائدة: 45)، واتە: (لە

تەوراتدا نووسیمان لەسەریان‌و پێوستمان کرد کە بێگومان هەرکەسێك بە دەستی ئەنقەست کەسێك بکوژێ ئەکوژرێتەوە لەبەرانبەریدا).

هەروەها ئەبوئەعەلای مەودودی ڕای وایە کە ئەو هەرێمانەی زۆرینەی ناموسڵمانی تێدا دەژی دەتوانن یاسایەکی تایبەت بە خۆیان هەبێت کە لەگەڵ دینەکەی خۆیاندا بگونجێت.

8. ئیسلام لە تیۆری دەسەڵاتیدا بانگەشەی دەسەڵات‌و حکومەتی دینی نەکردووە، بەڵکو دەوڵەتێکی مەدەنی پێکدەهێنێت، ئەوەش خاڵی جیاکەرەوەی سەرەکی نێوان دەسەڵاتی مەسیحییەتە لە سەدەکانی پێشوو لەگەڵ دەسەڵاتی ئیسلامیدا، ئیسلام دین‌و دەوڵەت پێکەوە گرێ دەدات، دین دەبێتە فاکتەری بەهێزکردنی کاروبارەکانی حکومەت‌و دەسەڵات بۆ خزمەتکردن بە خەڵك‌و جەماوەر، نەك دین بکرێتە هۆکارێك بۆ چەوساندنەوەو ملکەچکردن و ستەمی دینی، بنەما گشتییەکانی دەسەڵات‌و سیستەمەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی‌و ئابووری‌و سیاسی لە ئیسلامەوە وەردەگیرێت بەڵام هەرگیز لە کاروباری حوکم‌و دەسەڵاتدا پەنا نابرێتە بەر مەسەلەیەکی غەیبی‌و نەزانراو، دەبێت هەمووکاروباری حاکم‌و دەسەڵات‌و دەزگاکان ئاشکراو دیار بێت بۆ جەماوەر،دەبێت لە لایەن خەڵکەوە دەسەڵاتداران چاودێری بکرێن‌و موحاسەبەو لێکۆڵینەوە هەبێت، هیچ حاکم‌و دەسەڵاتدارێك لە ئیسلامدا ناتوانێت بانگەشەی مەعصومییەت‌و خۆ تەقدیسکردن بکات‌و ناتوانێت داوای گوێڕایەڵی‌و پابەند بوونی ڕەها بکات، ئیمامی ماوەردی لە (الاحکام السلطانیة)دا ئاماژەی کردووە بە هەندێك ئەرکەکانی حاکم کە زۆربەی بریتییە لە کۆمەڵە کارێکی مەدەنی، زۆربەیان پەیوەستن بە کاروباری خەڵك‌و خزمەتگوزاری پێشکەش کردن، بۆ نموونە :

1. ڕاپەڕاندنی کاروبارە دینیەکان وەك پیش نوێژی کردن بە خە ڵك .
2. پاراستنی ئاسایشی خەڵك.
3. جیهاد بەرپاکردن.
4. دابینکردنی ڕۆزی خەڵك.
5. دامەزراندنی کاربەدەست‌و فەرمانبەران.
6. سەرپەرشتی‌و پاراستنی ئەهلی (زمە).
7. ڕاپرسی‌و ڕاوێژ لەگەڵ خاوەن پسپۆڕو بەهرەمەندەکان.
8. بەدواداچوونی پێویستی ئاوەدانی‌و ئاوەدانکردنەوە .
9. سەرپەرشتی باری کۆمەڵایەتی خەڵك.
10. دانانی کاتی کاروبارو خشتەی ئەرکەکان.

لە دەسەڵاتی ئیسلامیدا کە ناکۆکی دروست دەبێت لە نێوان حاکم‌و خەڵکیدا هەردوولا ملکەچ دەبن بۆ ئەو دەستورە ئاشکراو نووسراوەی کە هەیە، حاکم ناتوانێت پەنا بەرێتە بەر دەسەڵات‌و هێزی خوا، بۆی نییە بەڵگە بهێنێتەوە بەوەی کە جێگری خوایەو ئەو نێوەندە لە نێوان خواو خەڵکیدا، یەکێك لە ئەرکەکانی سەرۆك‌و دەسەڵات لە ئیسلامدا کە بریتیە لە پاراستنی دین‌و بانگەوازکردن بۆ دین مەبەست فەرزکردنی دین نییە بە زۆر بەسەر خەڵکیدا یان چەوساندنەوەی کەمینە ئاینەکانی تر بێت، ئەم ڕاستییەش لە لایەن فەیلەسوفی ئیسلامییەوە (مسکویة) کە ساڵی 1030ز کۆچی دوایی کردووە دووپاتکراوەتەوە کە دەڵێت: "شەریعەت دانراوی خوایە خەڵکی بە ویستی خۆیان پیادەی دەکەن بۆ ڕێکخستنی کاروبارو مامەڵەی خۆیان، چەسپاندنی دادگەری لە ئەرك‌و مافدا یەکێکە لە ئەرکەکانی حاکم، حاکم پاسەوانەو نابێت کەمتەرخەمی‌و ساردوسڕی بنوێنێت لە ڕاپەڕاندنی ئەرکەکانی، بەهۆی سەرقاڵی بە بەرژەوەندییەکانی خۆیەوە نابێت بەرژەوەندییەکانی خەڵکی لە یاد بچێت، هەرکات سەرۆك کەمتەرخەمی نواند، یان کارەکانی بە تەواوی جێبەجێ نەکرد، بۆ خەڵکی هەیە ئەو کەسە بگۆڕن بە کەسێکی تر کە بە تەواوی‌و ڕاست‌و دروستی هەستێت بەو ئەرکانە". لێرەدا دەبینین سەرۆك‌و حاکم لە ئیسلامدا بە پاسەوان ناو دەبرێت بۆ بەرژەوەندییەکانی خەڵك‌و بەدیهێنانی پێداویستییەکانیان‌و خەڵك

بۆی هەیە ئەو پاسەوانە لابدات‌و بیگۆڕێت، حاکمیش ناتوانێت بە ناوی دین‌و بە پشت بەستن بە دەسەڵاتی خوا خۆی فەرزبکات‌و ئیرادەی خەڵك پێشێل بکات، چونکە لە ئیسلامدا حاکم‌و خەلیفە کاردەکەن بە پێی شەریعەت کاردەکەن نەك تەفویز کرابن لە لایەن خواوە، دەسەڵاتیان بریتییە لە دەسەڵاتێکی دونیایی‌و بەڕێوەبردنی کاروباری خەڵك‌و جێبەجێ کردنی ئەوەی لە لایەن خواو پێغەمبەرەوە ﷺ دەستنیشان کراوە، بۆیان نییە لە ڕێنماییەکانی دین لابدەن بە کەمکردن بێت یان زیادکردن، حوکمی ئیسلامی حوکمێکی مەدەنییە بەو بەڵگەیەی کە داواکراوە لە هەموو هاووڵاتیانی ئەو دەسەڵاتە کە بەشداربن لەو دەسەڵاتەدا، بەرپرسیاریەتییان لەسەر دانراوە وەك واجبێکی پیرۆزو بەرز نەك وەك مافێك یاسا بۆی دەستنیشان کردبن، وەك لە دەقەکەی قورئاندا ئاماژەی پێدەکات (كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ) واتە: (ئێوە چاکترین نەتەوەیەکن) کە ئاماژەیە بۆ گشتگیری‌و هەموو خەڵك دەگرێتەوە، پێغەمبەری خواش ﷺ دەفەرموێت (كلكم راع وكلكم مسؤل عن رعيته)، واتە: (هەمووتان شوانن، کە ئاماژەیە بۆ بوونی بەرپرسیاریەتی بۆ هەموون هەرکەس بە پێی پلەو پایەی خۆی، هەمووشتان بەرپرسیارن لەوەی لە بەردەستاندایە)، قورئان لە چەندین ئایەتی تردا ئەم مەسەلەیەی دووپات کردووەتەوە، وەك دەفەرموێت: (وَالْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاء بَعْضٍ يَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ) (التوبة:71)، واتە: (پیاوان‌و ئافرەتانی باوەڕدار هەندێکیان پشتیوان‌و هاوکاری یەکترن فەرمان دەدەن بەچاکەو ڕێگری دەکەن لە خراپە). عومەری کوڕی عەبدولعەزیز دەڵێت: (گەر هەموو خەڵکی فەرمان نەدەن بە چاکەو ڕێگری نەکەن لە خراپە ئامۆژگاریخوازان‌و ئامۆژگاری کردن بۆ خوا کەم دەبێتەوە)، سیمایکۆمەڵگای ئیسلامی بریتییە لە چاکسازی کردن لە لایەن هەمووان بۆ هەمووان، تەنانەت زۆرێك لە فوقەهاکان ڕایان وایە ئەو کەسەی هەندێك جار خراپەو تاوان دەکات دەبێت فەرمان بدات بە چاکەو ڕێگری بکات لە خراپە، نەك لەبەر ڕیایی یان بۆ دووڕوویی کردن، بەڵکو بە هۆی ئەوەی گەر کەسێکیش هەندێکجار تاوان بکات هەمیشە لە حاڵەتی تاواندا نییەو ئەویش دەبێت بە بەرپرسیاریەتی خۆی هەستێت، بەم شێوەیە دەبینین کە دەسەڵاتی ئیسلامی هەوڵی بەدیهێنانی کۆمەڵگایەکی ئەهلی‌و مەدەنی دەدات بە جۆرێك تاکەکانی گەل بە گشتی خۆی بە بەرپرسیار بزانێت‌و بە شێوازێك کە بۆی دە لوێت دەبێت بەشداری بەڕێوەبردن‌و چاکسازی بکات، ئەمەش لە مێژووی دەسەڵاتی ئیسلامیدا بە جوانی ڕەنگیداوەتەوە کە دامودەزگا ئاینی‌و پەروەردەیی‌و خزمەتگوزارییەکان بە شێوەیەکی لامەرکەزی بەڕێوە براوە لە لایەن هاووڵاتیانەوەو حکومەت‌و دەسەڵات هەموو دامودەزگاکانی پاوان نەکردووەو بوارێکی فراونی هێشتووەتەوە کە خەڵکیش بە ڕۆڵ‌و ئەرکی خۆیان هەستن.

**پێنجەم:**

ئەو بنەمایانەی لە ئیسلامدا هاتووە لەگەڵ ئەم سەردەمەی ئێستادا ناگونجێت‌و داخوازییەکانی ئەمڕۆ ناهێننەدی، ئیسلام یەکناگرێتەوە لەگەڵ ئاستی ئەو پێشکەوتن‌و زانیارییەدا کە مرۆڤایەتی بە دەستی هێناوە لە ڕووی ئابووری‌و سیاسی‌و کۆمەڵایەتی‌و تەکنەلۆژیاوە.

لە فەرهەنگی ئیسلامیدا سیاسەت واتە: خزمەتکردن بە مرۆڤ‌و ڕێنماییکردنیان بۆ ئاسوودەیی دونیاو فەراهەمهێنانی ژیانێکی کامەرانی لە هەموو بوارەکانداو بۆ هەموو هاووڵاتیان بەبێ جیاوازی‌و لەسەر بنەمای دادگەری، ئاوەدانکردنەوەو بنیاتنانەوەی ژیان‌و ژیار مەیدان‌و چوارچێوەو کاری سیاسەتەو سیاسەت لە دیدی ئیسلامدا پەیوەستە بە بەرژەوەندی‌و بژێوی مرۆڤەکان، لە هەمان کاتدا بنەماکانی کاری سیاسی ئیسلامی هەمیشە گۆڕانکاری‌و نوێکاری تێدایەو پێشهاتەکان زیاترن لە بنەما نەگۆڕو جێگیرەکان، ئیسلامیش تەنها هێڵە گشتییەکانی داڕشتووە لە بواری سیاسەت‌و سیستەمی دەسەڵاتدا، دەرگای واڵاکردووە بۆ مرۆڤەکان کە چۆن بەرژەوەندییەکانیان دەپارێزن‌و چۆن بۆیان دەلوێت بەو شێوەیە دەسەڵات بەرن بەڕێوەو سیفەتی نەرمی‌و گونجاوی سیستەمی سیاسی ئیسلامی لە خزمەتکردنی مرۆڤەکاندایە، چونکە تەنها بنەما گشتی‌و هێڵە گشتییەکانی بۆ مرۆڤایەتی دەستنیشان کردووە، بەڵام سەبارەت بە چۆنییەتی جێبەجێکردنی ئەو هێڵە گشتی‌و بنەما گشتییەکان‌و دەستنیشان کردنی ئالیەت‌و میکانیزمەکان بۆ ئاوەدانکردنەوەو خزمەتکردنی مرۆڤ‌و پێشکەشکردنی خزمەتگوزاری ئەو بوارەی هێشتووەتەوە بۆ مرۆڤەکان کە عەقل‌و بیرکردنەوەو زانست بەکار بهێنن بۆ

گەشتن بە ئامانجو خواستو ویستو داخوازییەکانی ژیان،وە ئەم سیفەتەش وای کردووە داهێنانو گەشەکردنو نوێخوازیی گرنگترین سیمای سیستەمەکانی دەسەڵاتی ئیسلامیی بێت، کەواتە دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە ئیسلام هانی کۆششو هەوڵدانو بەدەستهێنانی هەموو هەنگاوێك دەدات کە خزمەتی مرۆڤایەتی تێدا بێت، هیچ کات ئیسلام قەدەغەو ڕێگری نەکردووە بۆ ئەو کۆششانەی دەکرێن لە ڕووی زانست و زانیارییەوە بۆ بەختەوەرکردنی مرۆڤ بەڵکو هانی خەڵکی دەداتو پاداشت لەسەر ئەو کارە چاکانە دەداتەوە، وەك نموونەیەکیش لەسەر هاندانی بیرکردنەوەو بایەخدان بە عەقڵ خوای گەورە لە قورئاندا لە (16) ئایەتدا ئاماژەی بە عەقڵ کردووە ، وەلە (2) ئایەتدا بە (النهي) ئاماژەی پێکردووە،وە لە (18) ئایەتدا باسی بیرکردنەوەی کردووە. جگە لەوەش سیاسەت لە ئیسلامدا تەنها ئەوە نییە کە لە دەقەکانی قورئانو سوننەتدا هاتووە یان تەنها ئەو کارانە ناگرێتەوە کە پێغەمبەرو هاوەڵانی کردوویانە، بەڵکو سیاسەتی ئیسلامیو سیستەمی سیاسی ئیسلامی ئەوەندە فراوانە کە هەموو ئەو کارو هەوڵو تێکۆشانو داهێنانەش دەگرێتەوە کە مرۆڤەکان بە دەستی دەهێنن بە مەرجێك پێچەوانەی یەکێك لە هێڵە گشتیو دەقەکان نە بێت کە لە لایەن پەروەردگارەوە دەستنیشا ن کراوە. بۆیە زانایان ڕایان وایە کە دەرگای ئیجتیهادو بیرکردنەوەو هەوڵدان بۆ داهێنان بەردەوامە بەهۆی:

1. بەردەوامیو نەمری شەریعەتی ئیسلام.
2. گشتگیری شەریعەت لە هەموو بوارەکانو گشتگیری بۆ هەموو نەژادەکانو نەتەوەکان.
3. کۆتایی هاتن بە حوکمە شەرعییەکانو کۆتا نەبوونی گرفتەکان.
4. پێشکەوتنو گۆڕانکاری لە ژیاندا.

سیاسەتی ئیسلامی دووجۆر دابەشکردن پیادەدەکات، کە ئەویش بریتیە لەچاکو خراپ، ئەوەی چاك بێتو بەرژەوەندی مرۆڤەکانی تێدابێتو ببێتە هۆی پێشکەوتنو ئاسوودەیی مرۆڤەکانو ژیانی تاکەکان بەختەوەر بکات نەك تەنها ڕێگە پێدراوە، بەڵکو ئەو کەسەی هەستاوە بەوکارە دەبێتە خاوەن پاداشتو پلەی بەرزی ڕۆژی دواییو سەرکەوتن لە دونیادا بەدەست دەهێنێت، چونکە ئیسلام تەنها لەسەر جێبەجێکردنی دروشمەکان پاداشتی دانەناوە، بەڵکو خزمەتکردنی مرۆڤو گیاندارو ژیارو ئاسوودەکردنی مرۆڤەکانو هەر کارێك بڕواتە بازنەی چاکەو چاکەکاری، بەرەهایی خوای پەروەردگار پاداشتی لەسەر داناوەو خاوەنەکەی پلەی بەرز وەردەگرێت، (وَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَنُدْخِلَنَّهُمْ فِي الصَّالِحِينَ) (العنکبوت: 9)، واتە: (وە ئەو کەسانەی باوەڕیان هێناوەو کردەوەی چاکەیان کردووە بێگومان دەیانخەینە ڕیزی پیاوچاکانەوە)، کەواتە: چوارچێوەی ئیسلام لە کاروباری سیاسیدا هەموو شتێك دەگرێتەوە کە مرۆڤەکان دای بهێننو بەدی دەهێنن تەنها ئەو کارانە نەبێت کە لە دەقێکدا قەدەغەی تێدا بڕیاردراوە ،بێگومان ئەو قەدەغەکردنەش بۆ سوودو قازانجو بەرژەوەندی مرۆڤەکانە، لەوانەیە ئەو کارانەی خوا قەدەغەی کردووە بەرژەوەندی تاکێکی تێدا بێت، بەڵام زیانەکەی بۆ کۆمەڵگایە، یان لەوانەیە بەرژەوەندی کۆمەڵگایەکی تێدا بێت، بەڵا م دەبێتە هۆی زیان بۆ مرۆڤەکانی ترو کۆمەڵگەکانی تر، لەوانەیە هەندێك کار بۆ هەندێك قۆناغ ئاسایی بێت، بەڵام کە خوا قەدەغەی کردووە، چونکە بەزیان دەگەڕێتەوە بۆ نەوەکانی داهاتوو، قەدەغەکردنو حەرامکردن بێ هۆکارو مەبەستێك نییە، بۆ نموونە کە خوای گەورە سو (الربا) حەرام دەکات بەڵی بەرژەوەندی تاکێك یان بانکێکی تێدایە، بەڵام بە زیان دەگەڕێتەوە بۆ سەر کۆمەڵگاو چینی دەوڵەمەندو دەسەڵاتدار چینی ناوەڕاستو هەژار دەچەوسێننەوە و ئیستغلالیان دەکەن، لە پاشە ڕۆژیشدا لەوانەیە ببێتە هۆی دروستبوونی چەندین تاوان وناڕەوایی تر وەك کاتێك کە قەرزدار ناتوانێت هەستێت بەو ئیلیتزامەی لەسەریەتی ناچار ملکەچ دەکرێت بۆ زۆر ستەمی تر کە دەگاتە ناموس شکاندنو ئابڕوبردنو زیندانیکرد ن تا دەگات بە کۆیلەکردن، زانایان لەم ڕووەوە زۆر فەتواو بنەمای شەرعییان داناوە لەوانەش دکتۆر یوسف قەرزاوی دەڵێت: "بنەڕەتو بنەما لە کاروباری دروشمەکانو هەرکارێك پەیوەست بێت بە بنەماکانی خواپەرستیو عەقیدە، بریتییە لە شوێنکەوتنو پابەندبوون، بەڵا م هەرکارێك پەیوەست بێت بە ژیانی دونیا و عاداتی خەڵك بریتییە لە داهێنان"، مەقەریزی لەم بارەیەوە دەڵێت: "سیاسەت ئەو یاسا دانراوەیە کە ڕەچاوی ئادابو بەرژەوەندیو ڕێکخستنی کاروبارەکان دەکات"، هەر ئەم بنەمایەش وایکردووە کە دەسەڵاتدارانو کاربەدەستانی ئیسلامی بە درێژایی مێژوو، بەپێی وەزعو بارودۆخ گۆڕانکاری

دروست بکەن، لە مومارەسەی سیاسیو دەسەڵاتدا وە تەنانەت هەندێکجار پەیوەست نەبن بە دەقە شەرعییەکانی قورئانو سوننەت لە پێناو بەرژەوەندی گشتییو بەرژەوەندی خەڵك، هەر وەك چۆن عومەری کوڕی خەتتاب ڕێگەی نەدا بە دابەشکردنی زەویو خاکی عێراق بەسەر ئەو سەربازانەی کە ڕزگاریان کردووە، هەروەها دەستکاریکردنی ڕێژەی جزیەدان، جێبەجێ نەکردنی سزاو سنوری دەستپڕین لەو ساڵەدا کە گرانی هات بەسەر خەڵکیدا کە بە ساڵی (رەمادە) ناسرابوو، هەر ئەوەش وای کرد لە عەلی کوڕی ئەبوتالیب کە فەرزی کرد لەسەر خاوەن پیشەکان کە هەرشتێك لە بەردەستیان بێت دەبێت زەمانەتی بکەن، لە کاتێکدا پێشتر دەستی خاوەن پیشەکان دەستی ئەمانەت بوو، ئەویش بە هۆی گۆڕانی سروشتو ئاکاری خەڵکەوە بوو، هەروەها مەعازی کوری جەبەل لە یەمەن هەستا زەکاتی چنینی وەردەگرت لە بری گەنم بە هۆی پێوستی خەڵك بەو شتومەکانە، گۆڕانی هەندێك بنەمای شەرعیو بنەما جێگیرەکان لە پێناو بەرژەوەندی خەڵك سیستەمێك بووە زانایان ودەسەلاتی ئیسلامی پیادەییان کردووە بە پێی بارو دۆخ و پێداوویستیو توانا مادیو سیاسیەکان، لەبەر زەرورەتو پێویستی ژیان گۆڕانکاری بواری ئیداریو سیستەمی بەڕێوەبردنی گرتوەتەوەو پێشکەوتنی گەورەی بە خۆیەوە بینیوەو دەستکاری کراوە بە هۆی گۆڕانکاری عەقلیەتو ژیانی مرۆڤەکانەوە، نموونەش لەسەر ئەم بنەمایانە دەسەڵاتی ئیسلامی لە سەرەتادا شێوەو شێوازێکی سادەو ساکاری هەبووە بەهۆی سادەو ساکاری ژیانی عەرەبو ئەو کۆمەڵگایەی کە پەیامی ئیسلامی تێدا هاتەخوارەوە، بەڵام لەگەڵ پێشکەوتنو فراوانبوونی دەسەڵاتی ئیسلامی دەبینین ئالیەتو شێوازی کاری دەسەڵاتو سیاسەتی ئیسلامی، داهێنانو پێشکەوتنو گۆرانی بەخۆیەوە بینیوەو هیچ ڕێگریو قەدەغەکردنێکیش نەبووە، دەسەڵاتی ئیسلامی فەلەکناسیو بیرکارییان لە هیندییەکانەوە وەرگرت، بەڵام نەڕۆشتن بتپەرستی هیندییەکان بچەسپێنن، چونکە فەلەکناسیو زانستی حساب خزمەت بە مرۆڤەکان دەکات، بەڵام بتپەرستی زیان بە دونیاو ڕۆژی دوایی مرۆڤەکان دەگەیەنێت، دروستکردنی مەنجەنیقو قەڵای دەوری شارەکان دەسەڵاتی ئیسلامی لە ڕۆمانەکانەوە فێربوون، بەڵام عیسا پەرستنیان لێوەرنەگرتن، سیستەمی وەزارەتو دیوانەکانیان لە فارسەکان وەرگرت، بەڵام ئاگرپەرستیان لێوەرنەگرت، چونکە مرۆڤ پەرستنو ئاگر پەرستن کەسایەتی مرۆڤ دادەبەزێنێتو زیان بەڕێزو عەقلی مرۆڤ دەگەیەنێت لە ژیاندا، لە ئێستاشدا هێنانی هەموو تەکنەلۆژیایەك لە وڵاتە ڕۆژئاواییەکان یان لەهەر وڵاتیکی تر، سوودوەرگرتن لە سیستەمە سیاسییەکان یان بەرنامە کۆمەڵایەتییەکان بێ هیچ دوودڵییەك کارێکی ڕەوایەو پێویستەو پێچەوانەی سیستەمی ئیسلامی نییە، بۆنموونە لە بواری سیاسیدا شێوازی هەڵبژاردنەکانی دونیا کە ئێستاکاری پێ دەکرێت، هەڵبژاردنی ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ، هەڵبژاردنی لیست یان هەڵبژاردنی تاك، هەڵبژاردنی بازنەیی یان هەڵبژاردنی لیست، ئەمانە ئیسلام بێ سڵکردنەوە کاری پێدەکات، بەڵام لەگەڵ ئەوەدایە کامیان زیاتر لە دادگەرییەوە نزیکەو لەگەڵ بارودۆخی ئەو میللەتەدا دەگونجێت ئەوەیان بچەسپێنرێت، یان سیستەمی دەسەڵاتەکانو شێوازی کاریان ئایا سەرۆکایەتی بێت یان پەرلەمانی، دەستور نووسراو بێت یان عورفی، ئەمانە خراونەتە دەست مرۆڤەکانو دەتوانن ئیجتیهادی تێدا بکەن، چۆن بەرژەوەندیان دەخوازێت دەتوانن بەو جۆرە هەنگاو هەڵبگرن، بەڵگە مێژووییەکان ڕاستی ئەو بیرو بۆچوونانە دەردەخەنو دەیسەلمێنن کە ئیسلام خاوەن سیستەمێکی سیاسیەو ئەو سیستەمەش خەسڵەتێکی زۆر گرنگو بەهێزی هەیە ئەویش ئەوەیە کە هەمیشە لە خودی خۆیدا توانای گۆڕانکاری وگۆڕینی  هەیەو شایستەی پێشکەوتنو فراوان بوونە، لەگەڵ گۆڕانکاریو پێشکەوتنی ژیاندا دەڕواتو لەیەك ئاستو شێوازدا ناوەستێت، بۆ نموونە هەندێك کاروباری بەڕێوەبردنو سیستەم لە سەردەمی عومەری کوری خەتتابدا داهێنرانو کرانە یاسا کە لە سەردەمی پیغەمبەر ﷺو ئەبوبەکردا کاریان پێنەکراوە، بەڵام بە هۆی گۆڕانی ژیانو پێشکەوتنی بارودۆخەوە ئەو سیستەمو یاسایانە داهێنران لە لایەن دەسەڵاتی ئیسلامییەوە لەوانەش (موچە بڕینەوە بۆ هاووڵاتیان کە لەوەوپێش سیستەمی مووچە نەبووە، دانانی حەرەسی شەوانو گەڕان بەناو کوچەو کۆڵانەکاندا بۆ پاسەوانیو دڵنیایی لە ئارامیو ئاسایشی خەڵك، دانانی خانەیەك بۆ ئاردو خواردنی خەڵك بۆ دابینکردنی پێویستی خەڵك لە ڕووی خواردەمەنییەوە بە تایبەت بۆمنداڵان)، لە سەردەمی عەلی کوڕی ئەبوتالیبدا پۆلێنی پۆلیس کراوەو دوو جۆر پۆلیس هەبوون یەکیان بە ناوی (الشرطة الکبری) بۆ بەدواداچوونی کاروباری دەوڵەتو گرتنی ئەو کەسانەی کە خاوەن پلەو پایەی کۆمەڵایەتین لەناو کۆمەڵگادا، (الشرطة الصغری) بۆ گرتنو ڕاوەدونانی تاوانبارانو ڕێگرو خراپە کاران کە

دەیانویست ئاژاوەو خراپە کاری بڵاوبکەنەوە، لە سەدەی سێهەمی کۆچیداو لە سەردەمی دەوڵەتی ئەغالیبەدا لە مەغریبی عەرەبی کۆمەڵێك سیستەمی ئیداری لە دەوڵەتی ئیسلامی داهێنراون و دەسەلاتی ئیسلامی گۆڕانکاری زۆر بەسەر خۆیدا هێناو ڕۆژ بەرۆژ بەرەو پێشکەوتن و بەهێزبوون ڕۆشتووە، لەوکاتەدا جگە لە (امیر المؤمنین) کە نازناوی سەرۆکی دەوڵەت بوو ئەم پۆستانەش هێنراونەتە بوون وەك:

- صاحب الخراج: کە بەرپرسی کاروباری دارایی و هەموو سەروەت و سامانە جۆربەجۆرەکانی دەوڵەتی لەژێر دەستدا بووە کە لە جێگەی وەزیری دارایی ئێستایە.
- صاحب البرید: کە بەرپرسی گەیاندنی پۆستەی خەڵك و دەسەلات بووەو چەندین فەرمانبەر لەو بوارەدا کاریان کردووەو بە ئەسپ و ماین پۆستەکانیان گەیاندووە، لە جێگەی وەزیری گەیاندنی ئێستا بووە.
- صاحب الجیش: کە بەرپرسی هەموو جۆرەکانی سوپا بووەو لە جێگەی وەزیری بەرگری ئێستا بووە.
- صاحب العمارة: کە بەرپرسی هەموو کەشتی و بەلەم و پاپۆڕەکان و کاروباری دەریاو ئاوەکان بووە، لە جێگەی وەزیری بەحری ئێستا بووە.
- العامل: بەرپرسی کاروباری ئیداری سەرۆك بووە بۆ هاووڵاتیان کە جێگەی وەزیری کاروباری سەرۆکایەتی وەزیران دەگرێتەوە.
- حاجب: کە بەرپرسی تەشریفات بووەو جێگەی سکرتێر یان وەزیری دیوان دەگرێتەوە.

گۆڕانکارییەکانی مێژوو لە سیستەم و دەسەلاتی ئیسلامی، بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە سیستەمی ئیسلامی بۆ هەموو سەردەم و سەدەو قۆناغێك گونجاوەو هەموو پێداویستییەکانی مرۆڤ لەخۆ دەگرێت و شیاوە بۆ چەسپاندن لە هەرکات و ساتێکدا بێت.

**شەشەم:**

هەندێك نووسەریش بۆچوونیان وایە کە بەرنامەی ئیسلام ناگونجێت بۆ ئەم سەردەمە، چونکە سەردەمی ئازادی ئافرەت و ڕۆڵدانە بە ئافرەت لە هەموو بوارەکاندا بەڵام ئیسلام ئافرەتی کۆتکردووەو بوار نادات بە ئافرەتان بەشداری ژیانی سیاسی و ڕۆشنبیری و ئیداری بکەن.

کێشەی گۆشەگیرکردنی ئافرەت بووەتە گرێیەك لە لای کۆمەڵێك لە نووسەران، بێگومان ئەم دیاردەیە زیاتر پەیوەستە بە عورف و نەریتی کۆمەڵگاکان نەك دینی ئیسلام، وە هەروەها ئەم دیدو بۆچوونەش دەگەڕێتەوە بۆ ورد نەبوونەوە لە دیدو بۆچوونی ئیسلام سەبارەت بە مەسەلەی ئافرەت و ڕۆڵیان لە کۆمەڵگادا، چونکە ئیسلام بەرنامەی بەشداری ئافرەتانی ڕێکخستووە لە بواری سیاسی و ڕۆشنبیری و کۆمەلایەتی نەك قەدەغەی کردبێت و کۆتی کردبن، بۆنموونە عومەری کوڕی خەتتاب لە لیژنەکانی چاودێری کۆمەلایەتی و ئابووری ئافرەتێکی دانابوو بە ناوی (شفاء) بۆ چاودێری بازاڕی مەدینەو هەستان بە ئەرکی فەرمانذان بە چاکەو ڕێگری لە خراپەکردن، لە سوننەتی کرداری پێغەمبەریشدا ﷺ ئەوەی ئاشکراو کارپێکراو بووە ئەوەیە کە ئافرەتان هاتوونەتە دەرەوە بۆ مزگەوت و جیهادو وەرگرتنی زانست و مامەڵە لە بازاڕو کاری پیشەیی، و کەسیش لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ ڕێگری نەکردووە، ئێمە دەبێت جیایی بکەین لە نێوان بڕیاری چەند کەس و لایەنێك کە زیاتر لەسەر بنەمای عورف و مەزاج کاردەکەن و دەجووڵێن،وە لە نێوان کارکردن بە بەرنامەو ڕێنماییەکانی ئیسلام، ئەوەی ڕای زۆربەی زانایانی لەسەرەو کاری پێدەکرێت ئەوەیە کە ئافرەتان بۆیان هەیە بەشداری هەموو کارێکی سیاسی بکەن لە بەشداری کردن لە ئەنجوومەنی تەشریعی و تەنفیزی و داموودەزگا حکومییەکان، لە هەموو بوارەکاندا تەنها ئەوەی کە ڕێگری لێکراوە سەرۆکایەتی سەرۆکایەتی دەوڵەت و سەرۆکایەتی دادگایە، بەڵام ئەبو جەریری تەبەریش ئەو ڕایەی هەیە کە ئافرت بۆی هەیە ئەو دوو پۆستەش وەربگرێت، وە هەروەها هەندێ زانای تریش لەسەر ئەو ڕایەن وەك ئیبن ڕوشدو ئیبن حەزم و ئیبن قودامە، ئەرکی گۆڕانکاری و دەسەلات و ململانێی سیاسیش هەرچۆن لەسەر پیاو فەرزکراوە بەهەمان شێواز فەرزو پێویست کراوە لەسەر ئافرەت وەك خوای تاك و تەنها دەفەرموێت: (وَالْمُؤْمِنُونَ وَالْمُؤْمِنَاتُ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاء بَعْضٍ يَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ) (التوبة: 71)، واتە: (پیاوان و ئافرەتانی باوەڕدار هەندێکیان پشتیوان و

یارمەتیدەری هەندێکی تریانن فەرمان دەدەن بە چاکەو ڕێگری دەکەن لە خراپە)، پێغەمبەری خواش ﷺ ئەم ڕاستیەی دوویات کردووەتەوە بەو فەرمودەیەی کە دەفەرموێت: (النساء شقائق الرجال)، ئەبوداودو ئەحمەدو تورموزی ڕیوایەتیان کردووە، واتە: (ئافرەتان هاوشانی پیاوانن)، کە ئەمەش جوانترین سیمای یەکسانی دەگەیەنێت لە نێوان پیاوانو ئافرەتاندا لە ڕووی نرخی مرۆڤایەتیو یەکسانی لە مافو ئەرکی کۆمەڵایەتیو یەکسانی لە بەرپرسیاریەتیو یەکسانی لە پاداشتو سزادا، ئەم یەکسانییەش لە دیدو بۆچوونی ئیسلامدا بەرجەستە بووە لە سەرچاوەی دروستبوونو مرۆڤبوونو یەک سەیرکردنی ئیسلام بۆ ئافرەتو پیاو لە هەموو ڕوانگەکانەوە بەبێ جیاوازی.

**حەوتەم:**

هەندێك لە ڕۆشنبیران بەڵگەی ئەوە دەهیننەوە گوایە سیستەمی ئیسلامی لەگەڵ وەزعی ئێستا ناگونجێت، چونکە بوار بە دیدوبۆچوونی سیاسی جیاواز نادات‌و بواری دروستکردنی حزبو ڕێکخراو نادات، ئۆپۆزسیۆن بوونی نابێت لە دەسەڵاتی ئیسلامیدا.

ئەوەی لە مێژووی ئیسلامو لە بنەماکانی ئیسلام سەرنج بدات دەبینێ ئۆپۆزسیۆنو ڕەوتی بەرانبەر لە دەسەڵاتی ئیسلامیدا ڕۆڵی گەورەی هەیە، بەڵام مەرجدارو ڕێکخراوە، ئیسلام بواری داوە بە ڕای جیاوازو ئازادیداوە بە خەڵکی کە ڕای خۆی بڵێتو داکۆکی بکەن لە مافەکانی خۆیان، بەپێی ڕای زۆربەی زانایانی هاوچەرخ دروست کردنی حزبو ڕێکخراو بەناوی جیاجیاو لە سەر دیدو بۆچوونی جیاواز ڕێگە پێدراوەو پێچەوانەی دەقە شەرعیەکان نیە، ڕەخنەگرتن دەرگای والایە لە بەرانبەر دەسەڵات، بەڵام ئیستراتیجیەتو ئامانجی ئۆپۆزسیۆن بریتییە لە هەوڵدان بۆ گۆڕانکاری لە پێناو خزمەتکردندا، ڕەخنەگرتن لە سنوری ئاکارو ڕەوشتی ئیسلامیدا بێت، مەبەستیش لە ڕەخنە ڕاستکردنەوەو ڕێککردنەوەی هەڵەو کەموکورتییەکانی دەسەڵاتە، ڕەخنەگرتن دەتوانرێت وەك تاك بێت یان وەك گروپو ڕێکخراوی مەدەنی یان حزبو دەستەی سیاسی بێت، بەڵام ئەوەی ڕێگەی لێ گیراوەو قەدەغە کراوە لە ئیسلامدا، بریتییە لە هەڵمەتی ئابڕووبردنی تاك، کەسایەتی شکاندن، جنێودانو تۆمەت بۆ هەڵبەستنو ڕوشاندنی کەرامەتی کەسایەتییە دڵسۆزەکان بە بێ بەڵگە، یان تەنها مەبەست لە ڕەخنەگرتن بریتی بێت لە هەڵمەتی هەڵبژاردن، یان گۆڕینو لەقکردنی دەسەڵاتی کەسێكو شوێنگرتنەوەی ئەو کەسە بێت نەك خزمەتو یارمەتی هاووڵاتیان، یان داکۆکی بێت بۆ بەرژەوەندی تاکیو حزبی، ئەمجۆرە موعارەزەیە ئیسلام ڕێگری لێدەکاتو بواری نادات، چونکە لەو کێشمەکێشمەی نێوان تاكو گروپە سیاسیەکان مافو داخوازییەکانی هاووڵاتیان لەیاد دەچێتو تەنها پێوەر دەبێتە حزبو پلەوپایەی سەرکردە حزبییەکان، ئیسلامیش کە بواری داوە ئۆپۆزیسیۆن هەبێت بۆ ئەوەیە ببێتە چاودێر بەسەر دەسەڵاتەوەو حاکمو سەرۆك بێدار بکاتەوە لە کەموکورتی کاروبار، و داکۆکی بکات لە مافەکانی جەماوەر، بەڵام ئەم سیستەمەی ئێستا هەیە بۆ موعارەزەو ئۆپۆزیسیۆن تەنها گۆڕینی حزبو سەرکردەو ناوێکە بە ناوێکی ترە، ومونافەسەش زیاتر لەسەر بنەڕتی حزبیو موزایەدە سیاسییەکانە نەك غەمخواردن لە خەڵكو داخوازییەکانیان، لێرەدا ئەو سیستەمەی ئیسلام داوای دەکاتو دەیەوێت پیادە بکرێت زیاتر لەگەڵ مەفهومو تێگەشتنی ئۆپۆزیسۆن یەکدەگرێتەوە تا هەڵوێست و سیستەمی کاری ئۆپۆزسیۆنی ئەمرۆ کە لە زۆرێك لە وڵاتاندا پیادە دەکرێت وەك پێناسەی ئۆپۆزسیۆن کراوە لە (الموسوعة السياسي)دا (بە چالاکیو جموو جوڵێکی بەرانبەر حکومەتو دەسەڵات دەوترێت کە لە لایەن هێزێکەوە یان زیاترو لە نێوخۆی کۆمەڵگەدا ئەنجام دەدرێت بۆ بەدیهێنانی ئەو خواستانەی جێگەی بایەخی میللەتن)، ئەمەش ئەوە دەسەلمێنێت کە هێزی ئۆپۆزیسیۆن دەبێت هێزێکی ڕێکخراوو یاسایی بێتو مەبەستیش لە بوونیان ڕێککردنەوەو ڕاستکردنەوەی هەڵسووکەوت وهەڵوێستی حکومەت بێت، واتە: چالاکی ئۆپۆزسیۆن جموو جوڵێکی ئیجابییە بۆ گەلو حکومەت نەك ڕوخێنەرو سلبی بێتو تەنها ئامانج بریتی بێت لە دروستکردنی ئاژاوەو کێشمەکێشمی سیاسی نێوان حزبەکان، پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (اعظم الجهاد كلمة حق عند سلطان جائر) واتە: (بەرزترین پلەی جیهاد بریتییە لە قسەی ڕاستو دادگەرانە لەلای دەسەڵاتدارێکی ستەمکار)، ئۆپۆزسیۆن لە ئیسلامدا بریتییە لە پرۆسەی بەرگریکردن لە پێناو جەماوەر گەر ئەو کەسە

